# بۆچی ناتوانم خودا ببینم

بۆچی ناتوانم خودا ببینم؟ خودا چەند گەورەیە؟ خودا لە کوێیە؟ ئەی کێ خودای بەدیهێناوە؟ بوونی خودا چلۆن بوونێکە؟ بۆچی خودا یەکتایە؟ خودا چۆن دەتوانێت لە هەمان کاتدا ئەو هەموو کارە ئەنجام بدات؟ بۆچی خودا بۆ بەدیهێنانی میوە درەختەکان دەئافرێنێت؟ ئەگەر خودا بەدیهێنەرە، ئەی سروشت چ کارەیە؟

تۆزکان تۆزە

و: ئاوات عبداللە بابان

ناوی کتێب: بۆچی ناتوانم خودا ببینم؟

نووسینی: نوزکان نۆزە

وەرگێڕانی: ئاوات عبدالله بابان

پێداچوونەوەی: دڵپاک قادر

تیراژ: (٢٠٠٠)دانە

نۆبەی چاپ: دووەم

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (١٢٨١)ی ساڵی ٢٠١٠ ی پێ دراوە

---

پەرتووكی یەكەم لە زنجیرەی

(ئەو پرسیارانەی تامەزرۆی زانینی وەڵامەكانیانم)

# بۆچی ناتوانم خودا ببینم؟

نووسینی

ئۆزكان ئۆزە

وەرگێڕانی

ئاوات عبداللە بابان



چاپی دووەم

١٤٣٣ك -- ٢٠١٢ز

# تامەزرۆی ناسینی خودام

# گفتوگۆیەکی بچوك

کورەکەم چەند ڕۆژ پێش ئێستا لێی پرسیم: ((بابە، من بۆچی ناتوانم خودا ببینم؟)). ئەم پرسیارەی لە کاتێکی چاوەڕواننەکراوی وەهادا لێکردم کە نەمزانی چی وەڵامێکی بدەمەوە. خۆ بێگومان وەڵامەکەیم دەزانی بەڵام پرسیارە کتوپڕەکەی کوڕەکەم پەشۆکاندمی، لە وەڵامدا وتم: "ئا"، هین. چاوەکانی زەق کردەوەو چاوی بڕییە ناوچاوم، وەکو ئەوەی بڵێت: "دەی بابە وەڵامێکم بەرەوە". بۆ ساتێك قسەکەم هێناو بردم. خۆتان لێم تێدەگەن کەوتبوومە چ بارێکەوە! دەمم تەتەڵەی دەکرد: "ئا، هین، نەزانی چۆنە". لە کۆتاییدا چەخماخەیەك بە ناوەڕاستی سەرمدا هات، ئەم وەڵامەم بۆ هات:

"چاوەکانی تۆ زۆر بچوکن، خوداش زۆر گەورەیە. هەربۆیە ناتوانیت خودا بەچاو ببینیت کوڕەکەم!"

کوڕەکەم: "ئا!!!، کەواتە وایە!". هێندێك یاریی منداڵانەکەی دەستی ئەمدیو ئەودیو کردو وەك ئەوەی ئەسڵەن هیچ پرسیارێکی نەکردبێت لێیداو چووە ژورەکەی خۆی.

پێدەچێت ئەم وەڵامە بۆ منداڵێك لەو تەمەنەدا بەس بێت.
هەر چۆنێك بوو بۆ ئێستا بەڕێم کرد، بەڵام دەمزانی لەمەودوا بەلێشاو دەربارەی خودا پرسیارم لێدەکات، بۆیە پێویست بوو بەباشی خۆمی بۆ ئامادە بکەم.

بەڵێ لەدایکبوونی بیرۆکەی نووسینی وەها پەرتووکێك دەرئەنجامی پرسیاری کتوپڕی کوڕەکەم بوو کە دەپرسێت"بۆچی ناتوانین خودا ببینین؟". بێگومان بۆ وەڵامدانەوەی هەموو ئەو پرسیارانەی کوڕەکەم دەیکات لە داهاتووداو لەناویشیاندا ئەوانەی پەیوەستن بەخواوەندەوە دەبوو کەرەستەی باش و ئامادەم لەلابێت.

لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك فێری خوێندنەوەو نووسین بوو خودی خۆی دەتوانێت بەئاسانی وەها پەرتووکێك بخوێنێتەوە.

لە هەموویشی گرنگتر ئەوەیە، گەر بێتو من بەدواداچوونەکانم لە بوارەکەدا لەشێوەی کتێبێکی منداڵاندا کۆبکەمەوە ئەوا نەك تەنیا کوڕو کچەکەی خۆم، بەڵکو هەموو منداڵە ئازیزەکانی تر دەتوانن سودی لێ وەربگرن. ئەوەشمان بیر نەچێت بەدەر لە منداڵان گەلێك جار گەورەش ئەم پرسیارانەی لا دروست دەبێت. هەندێکیان بەدوای وەڵامەکەیدا دەگەڕێن و دەیدۆزنەوە، هەندێکیش دەڵێن ((وەڵامی ئەم پرسیارانە نەزانراون)) و

بەدرێژایی ژیانیان ئاوەزیان لەگەڵ ئەو پرسیارە بێ وەڵامانەدا هاودەم دەبێت. بەڵام بزانن و هەرگیز بیرتان نەچێت کە ((ئەگەر پرسیارێك لە مێشکتاندا دروست ببێت، ئەوا بێگومان وەڵامێکی هەیە)).

بەڵێ تەمەن گەورەکانیش ئەم پرسیارەو هاوشێوەکانی دەکەن. بۆیە پێتان دەڵێم ئەم کتێبە لە جێگایەك دابنێن کە بەئاسانی دایك و باوکتان زوو زوو بیبینن و دەستیان پێی رابگات. دوایش خۆتان ون بکەن. دایك و باوکی خۆشەویستتان کە چاوی پێکەوت سەرەتا سەیرێکی چواردەوری خۆی دەکات و پاشان پەرتووکەکە دەگرێت بەدەستیەوەو پەڕەکانی چاو لێ دەکات. خۆ لە خۆڕا نەیان وتووە((فێربوون تەمەنی بۆ نیە)).

بەرلەوەی لەگەڵ کتێبەکەدا بەجێتان بهێڵم دەمەوێت شتێکتان وەبیر بهێنمەوە پێویستە هەمیشە لەیادتان بێت: مەترسن لە پرسیارکردن و دەست هەڵنەگرن لە بەدوادا گەڕان. چونکە پرسیارکردن وەکو کلیلەو هەر پرسیارێك دەرگایەکتان بۆ ئاواڵادەکات. هەروەها لەپشت هەموو دەرگایەکیشەوە دونیایەکی جیاواز هەیە.

دوو دڵ مەبن لەسۆراغ کردن، دەست بگرن بەکلکی پرسیارەکانەوەو ئەوەندەی بۆتان دەکرێت ڕایکێشن، بەدوایدا

وەڵامێکی زەبەلاح دێت بەو مەرجەی لەڕێگای چنگخستنی وەڵامی دروستدا خۆتان ماندوو بکەن و گرنگی نەدەن بە بەربەستەکان. بپرسن، بکۆڵنەوەو بخوێننەوە.

سەرەڕای ئەمانەش پرسیارکردن جۆرێکە لە نزاکردن (دوعا). کردنی هەر پرسیارێك بەم واتایە دێت: (دەمەوێت فێرببم، دەمەوێت تێبگەم، دەمەوێت بناسم و زیاتر خۆشم بوێت!).

لەم چەشنە دوعایانە زۆر بکەن تاکو زیهن و دڵتان بەنوری زانیاری پڕ ببێت، داواکارم هەردەم ڕێگاتان ڕۆشن بێت.

لەم پەرتووکی ((بۆچی ناتوانم خودا ببینم؟))دا هەوڵدەدەین وەڵامی چەند پرسیارێك دەربارەی بەدیهێنەرمان بدەینەوە.

ئەم پرسیارانەش لەوانەن کە زۆر بایەخدارن و زوو زوو دەکرێن. بێگومان پرسیاری هەمەچەشنی تریشتان لەلا دروست دەبێت، بەو هیوایەی وەڵامی ئەوانیش لە کتێبانی هەمە چەشنی تردا وەدەست بخەن و هیچ کاتێك بوێری پرسیارکردن لەدەست نەدەن و بەناوی بڵاوکراوەکانی (ئوغور بۆجەگی) واتە (خاڵخاڵۆکە)وە ژیانێکی ئاسودەتان بۆ دەخوازم.

**ئۆزکان ئۆزە**

# بۆچی ناتوانم خودا ببینم؟

ئایا دەتەوێ خودا ببینیت؟ پێ دەچێت بەبێ گومان و دوودڵی بڵێیت"بەڵێ حەزدەکەم خودا ببینم". لەمە تێدەگەم و مافت پێدەدەم چونکە خودی خۆیشم ئارەزووی بینینی خودا دەکەم. هەڵبەت تامەزرۆی بینینی خودایەکم کە ئەو خۆرە پرشنگدارەی لە ئاسماندا وەکو چرایەکی ڕووناك ڕاگرتوە. ئایا دەگونجێ تامەزرۆی لیقائی خودایەك نەبین کە تاریکی شەو بەڕووناکی مانگ و ملیارەها ئەستێرەی قەشەنگ ڕووناك دەکاتەوەو وەك ڕۆژی ڕوناکی لێدەکات .

سەیرێکی ئەم زەویەی خۆمان بکە! وەکو تۆپێکی زەبەلاحی باسکە لەبۆشایی ئاسماندا ڕاوەستاوە. نەخێر نەخێر هەڵەم کرد! ڕاوەستانی چی! بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە، ئەویش بەخێراییەکی لەڕادەبەدەر. منیش بەئاواتی بینینی ئەو خودایەم کە ئەم گۆی زەوییەی لە بۆشاییدا ڕاگرتوەو دەیسوڕێنێتەوە بەبێ ئەوەی بکەوێتە خوارەوە.

ئایا چۆن تامەزرۆی ئەو بەدیهێنەرە نەبین کە ڕوپۆشی دونیای بەئاسمانێکی شینی بێگەرد کردووە؟

کێ هەیە نەیەوێت ئەو پەروەردگارە ببینێت کە پارچە هەورە زەبەلاحەکان لەناو ئاسماندا ئەمسەرو ئەوسەرو جێگا گۆڕکێیان پێ دەکات، هەورگەلێك لە ناخی ناسکیاندا بەئەندازەی دەریاو زەریاکان ئاو هەڵدەگرن!

ئەی ئایا چ شتێك سروشتی ترە لە ویستی ناسین و بینینی خودایەك کە بەفەرمانی ئەو لە هەورە پەشمەك ئاساکانەوە دڵۆپەکانی باران دەردێنێت و بەفرێکی بێگەرد دەبارێت کە هیچ دانەیەکی لەوی تر ناچێت؟

بڕوانە ئەو درەختانە، بەهۆی ڕەگەکانیانەوە ـ کەبەناخی زەویەکەدا ڕۆچوە ـ ئاوێکی قوڕاوی دەخۆنەوە، بەڵام لەسەر پەلەکانیان گێلاسی هەنگوین ئاسا، سێوی شیرین وەك شەکر،

هـەرمیٚ گـەلێك كـە هێنـدەی كفتـە بەلەزەتـەو هـەناری ئـاوداری میٚخۆش بەرهەم دێت.

ئایا كـیٚ هـەبێت نەیـەوێت خودایـەكی میهرەبـان ببینێت كە هەموو ئەم شتەجوانانە دەئافرێنێت؟!

دەپرسـیت: "بۆچـی نـاتوانم خـودا ببیـنم؟" بەڕاسـتی مـافی خۆتەو هیچ نەنگیەكی تێدا نییە. لەتۆ تێدەگەم.

منیش حەزدەكەم خـودا ببیـنم! حەزدەكـەم زیـاتر بیناسـم و زیاتر خۆشم بوێت.

بڕوانــە ئـەو گـوڵ و گوڵزارانــە، نێرگـز جۆرێكـە، گوڵـە بـاخ جۆرێكە، دەمەشێر جۆرێكی ترو نەخشـێكی تـرە. بۆیـە جێگـەی خۆیەتی تامەزرۆی بینینی ئەو یەزدانە بین كە پێشانگای بەهاری بەم تابلۆ ڕەنگاو ڕەنگانە دەڕازێنێتەوە...

ئای خوایە ئەوەندەی نەمابوو بیرم بچێت!

تەماشـایەكی ئـەو باڵنـدە چـكۆلانەی سـەرپەلی درەختـەكان بكە! سەیرێكی ئەو لەقلەقە گەورانە بكەو چاوێكیش لە دۆلفینـە زیرەكەكان بكە...

بۆ ساتێك چاوەكانت بنوقێنەو بـیر لـە هـەموو ئـەو باڵندانـەی دەیانناســی بكــەرەوە، بزانــە چـۆن لــە ئاسمانــدا باڵــەكانیان ڕادەوەشێنن و خۆیان دەدەنە بەر تەوژمی هەواو دەفڕن؟

دەنگی هەندێکیان چەندە خۆشەو پڕە لە ئاوازی مۆسیقا!

پەڕی کۆمەڵێکی تریان چەند ڕەنگینە!

هەندێکی تریان خانەی گەلێك جوان و ئەندازەیی دروست دەکەن و بێچوەکانیانی تێدا بەخێو دەکەن!

هەربۆیە من لەهەموو کەس زیاتر تامەزرۆی بینینی کەسێکم کە ئەو باڵندانەی بەدیهێناوەو دەنوك، باڵ، نینۆك و دەنگی ناسکی پێ بەخشیون. تۆش دەتەوێ ئەو ببینیت و دەپرسیت کە گوایا بۆچی ناتوانیت ئەو ببینیت؟

هەم من و هەم تۆو هەموو کەسێکی تر مافی خۆمانە ئەمە بپرسین.

تۆ سەرەتا تەنیا خانەیەك بوویت لە سکی دایکتدا، گەشەت کردو گەورە بوویت، ئایا ئەمە موعجیزە نییە؟

دەستەکانت، نینۆکەکانت، ڕوخسارت، چاوەکانت، دەمت، زوبانت، گوێچکەکانت، قژت و برۆکانت هەموویان لەو شوێنە تاریکەداو لە گەشەو زۆربوونی تەنیا دوو خانە دروست بوون. هەموو ئەم کردارانەش کرداری دەرئاساو ئێجگار قورسن.

دڵت، سیەکانت، گورچیلەکانت، مێشکت،... و ئەو ژمارە زۆرەی ئەندامەکانت لەناو لەشتدا جێگیرکراون و خراونەتە کار.

ئێستاش تۆ تامەزرۆی ناسین و بینینی ئەو بەدیهێنەرە دەکەیت و دەڵێیت"بۆچی ناتوانم خودا ببینم؟".

ڕاست دەکەیت و مافی خۆتە!

بەڵێ ئێستاش هەوڵدەدەم وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە بەڵام بەرلەوە دەبێت هەندێك شتت بیر بخەمەوە، بەئارامی گوێم بۆ ڕاگرە، چونکە هاوڕێکەم پرسیارێکی ئەوەندە ئاسانت نەکردوە وەڵامەکەی ئاسان بێت.

پرسیارەکە زۆر گەورەیە.

هەڵبەتە وەڵامی پرسیاری گەورەش پێویستە بەئەندازەی خۆی گەورە بێت.

## هەموو شتێك سنورێکی هەیە

هەموو شتێکی تۆ سنورێکی هەیە. بۆ وێنە دەتوانیت تاکو چەند کیلۆ قورسایی بەرزکەیتەوە؟ بیست، بیست و پێنج، سی...

هەرگیز ناگاتە سەد، ئەوە هەر باسی دوو سەد مەکە...چونکە قۆڵەکانت و ماسولکەکانی تری لەشت سنورێکی هەڵگرتنی قورساییان هەیە، ناتوانیت ئەو سنورە ببەزێنیت، گەر هەوڵبدەی بیبەزێنیت یان شوێنێکت دەشکێت یان لەژێر ئەو

بـارەدا دەمێنیتـەوە. گوێچـکەکانت سـنورێکی دیـاری کـراوی بیسـتنیان هەیـە، دەتوانیـت دەنگـی مامۆسـتاکەت لـە پۆلـدا ببیسـتیت، بـەڵام گوێـت لـەدەنگی مامۆسـتای پۆلەکـەی ئەوبـەر نییە.

دەنگـت سـنوری دیـاریکراوی هەیـە. ئەگـەر داپـیرەت لـە گوندێکی دوور بێت، هەرچەندە هاوار دەکەیت هاوار بکـە، بـەڵام ئەو گوێی لە دەنگی تۆ نابێت. بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ ئەو بکـەی دەبێت تەلەفۆنی بۆ بکەیت یان ئەو بێت بۆماڵی ئێوە.

باشە با ئێستا سەیرێکی لاقەکانت بکەین.

چەند خێرا دەتوانیت ڕابکەیت؟

بە ئەندازەی پڵنگێك خێرایت؟

بێگومان لاقەکانیشت سنوریان هەیە.

ئەگەر زۆر خێراش ڕابکەیت، پاش ماوەیـەك مانـدوو دەبیـت و ناچاریت ڕاوەستیت و پشوو بدەیت.

بەجارێك دەتوانیت چەند پەرداخ شیر بخۆیتەوە؟ دوو، نەتزانی سێ وانییە؟

چونکە گەدەش سنوری هەیە.

ئێستا پرسیارێکت لێدەکەم.

٣×٥= ؟

باشە باشە! پێویست بەپێکەنین ناکات! منیش دەزانم پرسیارێکی ئاسانە.

وەڵامی ئەمەیان بدەرەوە بزانم:

٧٧٧×٢١٣٤٥٩٤= ؟

چی بوو؟

ئەگەر ژمێریارت پێنەبێ تۆزێك قورسە. بەڵام خەمت نەبێ شتێکی ئاساییە. چونکە مێشکت سنوری خۆی هەیە.

بەئاسانی لە هەندێ بابەت تێدەگەیت و هەندێك پرسیار خێرا وەڵام دەدەیتەوە، بەڵام ناتوانیت لە هەموو بابەتێك بەو ئاسانییە تێبگەیت و خێراش وەڵامی هەموو پرسیارێك بدەیتەوە.

کۆمەڵە شتێك خۆت نایزانیت بەڵکو پاش پرسیارکردن لە یەکێکی زانا فێردەبیت، لەبەرئەوەی وەك وتمان مێشکیش سنوری هەیە.

وەك خۆت پێشبینیت دەكرد نۆبەی چاوەكانت هات، بەڕای تۆ ئەوانیش سنورێكیان هەیە؟

ئایا دەتوانیت هەر شتێك خۆت بتەوێ بەنیگایەك بیبینیت؟

لەڕاستیدا ئەگەر بێتو بەراوردێك بكەین لەنێوان ئەو شتانەی بەچاو دەیانبینین لەگەڵ ئەوانەی ناتوانین بەچاو بیانبینین، ئەوا خۆمان بەنابینا هەژماردەكەین.

واقت وڕنەمێنێت! ڕاستیەكەی وایە.

بە گوێرەی ئەو لێكدانانەی زاناكان كردویانە، ئێمە لە گەردونێكدا دەژین كە نیوەتیرەكەی نزیكەی (١٥) ملیار ساڵی تیشكییە.

هەموو دەزانین ئەمە ژمارەیەكی زۆر گەورەیە، بەلام ئەستەمە تێبگەین كە بەقەد چەندە گەورەیە.

بەڵێ (٧٠٪)ی ئەم گەردونەی كە نیوەتیرەكەی (١٥)ملیار ساڵی ڕوناكییە ئێمە هەر نازانین چییەو ناتوانین بیبینین. زاناكان ناوێكیان لێناوە، پێی دەڵێن (وزەی ڕەش).

(٢٥٪)یشی پێیدەڵێن(مادەی ڕەش) كە ئێمە هەرگیز ناتوانین بیبینین.

مایەوە (٥٪)، هەرچیەك دەبینین و دەبیستین لەناو ئەم بەشە كەمەدایە. بەلام پەلە مەكەو بڵێیت (بەخوا باشە!)،

چونکە چاوی مرۆڤ توانای بینینی تەواوی ئەم لەسەدا پێنجەی نییە. بەڵکو ئێمە دەتوانین بەشێکی کەمی ئەم ڕێژەیە ببینین.

وەکو لەسەرەتاوە وتم لەبەرامبەر گەردونەوە وەك نابینا واین. هەرچەند بەخاترانەیشەوە حسابی بکەین ئەوەی لەگەردوندا دەتوانین بەچاو بیبینین ناگاتە جێ پێی مێرووڵەیەك لە ناو پانتایی ڕووی زەویدا.

ئێستا مادام ناتوانین تەنانەت ئەم گەردونەی تێیدا دەژین بەڕێکوپێکی ببینین، ئەی بەئەقڵی کێ ڕەوایە بەدیهێنەری گەردون، ئەو بەدیهێنەرەی کە لە هیچ بەدیهاتویەکی ناچێت بتوانین بەچاو ببینین؟

# خودا بەچاوی ئاسایی نابینرێت

مـرۆڤ گـەلێك هـەن دەڵـێن (بـڕوا بەشـتێك ناكـەین بەچـاو نەیبینین)، "مادام ناتوانم بەچاو بیبینم، بـاوەڕم بـەبوونی خـودا نییە!"

ئەمە وتەیەكی تابلێی بەتاڵە، چونكە شـتانێكی زۆر هـەن كـە ناتوانین بەچاو بیانبینین بەڵام بەوپەڕی دڵنیاییشـەوە باوەڕمـان پێیانە. چەند نمونەیەك لەوانە:

- **هێزی كێش كردنی زەوی**
- **ژیری**
- **خۆشەویستی**
- **خۆشبەختی**
- **سۆز**
- **بیرو ئەندێشە**

بـاش دەزانیـت هـەموو ئەوانـەی باسمـانكرد چـین، وانییـە؟ لەكاتێكـدا نـاتوانین بەچـاو بیـانبینین. كەوایـە پێویسـتمان بـەبینینیان نییـە تـاكو بـاوەڕ بەهـەبوونیان بكـەین، هەرچـەند ناشتوانین بیانبینین گەر بشمانەوێت! نەبینینی شـتێك لەلایـەن مرۆڤـەوە مانـای نـەبوونی ئـەو شـتە نییـە. خـوداش هەرچـەند نایبینین بەڵام باوەڕمان پێیەتی‌و دەزانین بەدیهێنەرمانە.

# بۆ بڕواهێنانمان بەخواوەند پێویستمان بە بینینی ئەو نییە

بۆ باوەڕهێنان بەبوونی ئافەرێنمان پێویستمان بەبینینی ئەو نییە، ئەمەت بەنمونەیەك بۆ ڕوون دەكەمەوە! خوازیارم ئەم نمونەیە ببێتە چرایەك و بەرپێت ڕووناك بكاتەوەو وەڵامەكەت دەست بكەوێت!.

وەرە لەگەڵم باپێكەوە بڕۆین بۆ پێشانگایەكی نیگاركێشی. بڕوانە نیگاركێشەكان چەند نیگاری جوانیان كێشاوە. لەو دیوارەی بەرامبەردا تابلۆیەكی گەورە هەڵواسراوە! تابلۆی گردێكی خنجیلانەی بەگوڵاڵە سورە ڕازاوەیە كەچوارچێوەكەشی زێڕە. هەرچی ئاسمانی سەر گردەكەیشە ڕەنگی شینی دڵڕفێنە...پەڵە پەڵە هەوری سپی بێگەردی پێوەیە! دەیەها باڵندەی جوان و نەغمەخوێن بەتەرتیبی سەرنجڕاكێش و پۆل پۆل بەئاسماندا دەفڕن...

لە دورەوەش دارستانێكی سەوز بەدی دەكرێت... ئێستاش چەند پرسیارێكت ئاڕاستە دەكەم، پێدەچێت هەندێ لە پرسیارەكانم بەگاڵتەوگەپ بزانی بەڵام تۆ هەر وەڵامی خۆت بدەرەوە!

– ئەو تابلۆیە چەندە جوانە، وانییە؟

– زۆریش

– کێ ئەو تابلۆیەی دروست کردووە؟

– بێ گومان نیگارکێشێك!

– ئەو نیگار کێشەت بینیوە؟

– نەخێر!

– کەوایە چلۆن دەزانی نیگارکێشێك کێشاویێتی؟

ـ چونکە ڕێگەیەکی تر نییە! تابلۆیەکی وەها تەنیا لە نیگارکێشێك دەوەشێتەوە، بۆیە دەزانم!

– بەڵام خۆ ئەوت نەبینیوە!

ـ خۆ تابلۆکەم بینی. گوڵەکان، ئاسمانەکەی، باڵندەکان و هەورەکانیم بینی! ئەمانە هەر لەخۆیانەوە دروست نەبوون، مەحاڵە شتی وەها!

– باشە ئەگەر ئەو قوتوە بۆیەو فلچانەی لەسەر مێزەکەن بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەویادا بن، ڕۆژێك لەڕۆژان بڕیار نادەن تابلۆیەك دروست بکەن؟ دوای بڕیاردانیش ناتوانن دروستی بکەن؟ ـ وتت هەندێ لە پرسیارەکانم گاڵتەوگەپن بەڵام ئەمەیان لە گاڵتەوگەپیش دەرچوو. نەك هەموو تابلۆکە بەڵکو تەنیا یەك جێی فلچەش بەو جۆرەی کە تۆ دەیڵێیت دروست نابێت.

– دڵنیایت؟

– زۆر دڵنیام! بۆ دروست بوونی تابلۆیەکی لەم شێوە دەبێت وێنە کێشێك هەبێت!

– بەڵام ئەو وێنە کێشە لەم دەوروبەرەدا نییە، تۆ بڵێیت لە ناو تابلۆکدا نەبێت؟!

– چۆن شتی وا دەبێت؟ وێنە کێش چ کارێکی هەیە لەناو وێنەکەیدا؟ دەبێت لە جێگایەك بەدەر لە وێنەکەدا بێت.

– ئەی ڕات چییە بەرامبەر ئەو فلچەو بۆیانە، وێنەکێش یەکێك نەبێت لەوان؟

– شتی بێ مانا دەڵێیت! ئەو بۆیەو فلچانە گەر ملیارێك ساڵیش لەوێدا بن توانای دروستکردنی تابلۆیەکیان نابێت.

– بۆچی؟

– چونکە ژیرییان نییە! چونکە تواناییان نییە! چونکە ئەوان بێگیانن.

– زۆر باش وەڵامت دایەوە! وەرە بائێستا لە پێشانگاکە دەرچینە دەرەوە. سەیرکە هاتینە کوێ!

ئێرە قەد پاڵی گردۆڵکەیەکە، هەموو لایەك بەگوڵاڵەو شەوبۆ ڕازاوەتەوە... لەسەرەوە ئاسمانی شین، لەباوەشی میهرەبانی ئەم ئاسمانەدا چەندین پەڵە هەوری سپی بێگەرد هەیە، لەو

لاشەوە ئەو باڵندە جوانانە سەیربکە کە هەردەم لە حاڵەتی شادییان.

ئەم شوێنە زۆر لە تابلۆکەی پێشوتر دەچێت، وانییە؟

- بەڵێ بەڵام هێندە سەرسوڕهێنە ناتوانین تابلۆکەی لەگەڵ بەراورد بکەین، هەموو کەرەستەکانی ئێرە زیندوون.

- بەڕای تۆ ئەم دیمەنە جوانترە یاخود ئەوەی ناو تابلۆکە؟

- بێ گومان ئەم دیمەنە!

- باشە گەر کێشانی ئەو تابلۆیە خۆی لەخۆیەوە کارێکی گونجاو و ژیری بڕ نەبێت، ئەی دروستبوونی ئەم سروشتە جوانە خۆی لە خۆیەوە کارێکی شیاوە؟

- بە هیچ جۆرێك. ئەمانە خۆ...

- ڕاوەستە! پەلەمەکە لە وەڵامدانەوەدا. ئێستاش بەوردی چاوێك لە چوار دەورت بکە هیچ مەڵێ و تەنیا گوێ بۆ من ڕابگرە.

وەرە دانەوێرەوە، سەیری ئەم نێرگزە بکەین. باپەڕەکانی بژمێرین، لە ڕەنگەکانی بڕوانین، ئەم زەردە چەندە جوان لەگەڵ ئەم سپییەدا گونجاوە!

ڕات چییە بەرامبەر ئەو چیمەنە سەوزە قەشەنگە کە هەر وەك فەرشی بەهارە؟

بڕوانـــه ئـــەو هەنگانـــە لەســـەر پـــەڕەی گـــوڵان خـــەریکی سەماکردنن. هەنگە کۆشش کەرەکانیش بەبێ وچان لەم چڵ بۆ ئەو چڵ لە هەوڵداندان.

هەناسەیەکی قـوڵ هەڵمـژە، بـۆنی چـەند خۆشـە! وا هەسـت دەکەیت لە بازاڕی بۆن فرۆشاندایت. ئـەو پەپولانـە! سـەیرکە! سەیری باڵیان بکە، بەڵام ئاگاداربە دەستیان لێنەدەیت، چونکە زۆر ناسکن...

وەرە بـا لەسـەر ئـەو فەرشـە گوڵاویـە نەخشـینە رابکشـێین تەماشای ئاسمان بکەین.

ئاسمانی شینی کاڵ!

هەورە سـپییە نازدارەکـان، ئـەو لەقلەقانـەی کـە بـەخۆیان و دەنوکـــە درێـــژو باڵـــە زەبەلاحەکانیانـــەوە یـــان پەڕەســـێلکە نازدارەکان بەسەر سەرماندا دەفڕن.

لەو بەرەوە دارستانێك هەیە، دەبینیت هەموو ڕەنگە جیاوازە سەوزەکان لە درەختەکاندا بەدەردەکەوێت. درەختەکان چـەندە جوانن.

ئێستا بڵێ بزانم، ئەگەر بەهیچ جۆرێك نەشێت ئەو تابلۆیەی کـە لە چەند بۆیەیـەکی سـادە پێـك هـاتووە بـێ وێنـەکێش دروسـت بووبێ، ئایا سروشتێکی لەم جۆرە خۆی لەخۆیەوە دێتەبوون.

– نـــەخێر! نـــەخێر! هـــەرگیز! هـــەموو ئەمانـــە كـــاری پەروەردگارێكی كارسازە.

– بەلاَم خۆ ناتوانیت خودا ببینیت؟

– چ تـــەوفیرێكی هەیـــە، خـــۆ گـــوڵ و گـــوڵزارو، ئاسمـــان و هەنگەكان و پەپولەكان كە هەموو سنعەتی خواوەنـدن دەبیـنم. بۆنی خۆشی میسك ئاسای گولاَن هەڵدەمـژم، دەسـت دەدەم لـە پەڕەی ناسكی نێرگزەكان، هەورەكان چاو لێدەكەم، فڕەی باڵی باڵندەكان و كۆچ و ڕەویان دەبینم.

ئەگـەر خـودا بەچـاویش نـەبینم وەك ئـەوەی ببینـنم بـاوەڕم پێیەتی. هەموو ئەمانەو گەلێك شتی تری سەرنجڕاكێش و جـوان بەرهەمی سنعەتی پەروەردگارن.

## پرسیارێكی دیكەو كۆتا پرسیار

ئێستاش پێدەچێت ئاوا پرسیارێك لاتان دروست بێـت:"باشـە ئەوا ئێمە ناتوانین خودا ببیـنین، بـەلاَم ئایـا خـودا گـەر بیـەوێت ناتوانێت خۆیمان پێ نیشان بدات؟"

لەسەرەتادا پێم وتیـت كـە كۆمەڵـە هۆكـارێكی ژیرانـەو شـیاو هەیـە بـۆ زیـاتر ناسـین و خۆشویسـتن و ئارەزومەنـدیی بینینـی خودا. بەڵێ هەموو بەندەیـەكی ئـەو حـەزدەكات ببینێـت. پێـی خۆشە بزانێت خوداكەی ئەو كێیەو چۆن خودایەكە.

پـەروەردگاریش ئـەم داواکاریـەی بەنـدەکانی بـەبێ وەڵام ناهێڵێتەوە خۆی نیشانی بەندەکانی دەدات، بەڵام نەك لە دنیادا بەڵکو لە بەهەشتدا.

پێغەمبەری سەروەرمانﷺدەفەرموێت:

"دەنگێـك لـە بەهەشـتدا بـە بەهەشـتیەکان دەڵێـت: خـودای گەورە بـەڵێنێکی پێـدابوون ئێسـتا دەیـەوێت بـەجێی بهێنێـت". ئەوانیش دەڵێن:

- ئایـا خـودا بـە ڕزگـارکردنی ئێمـە لـە ئـاگرو، خسـتنە نـاو بەهەشـتمانەوە، ڕووی ئێمـەی سـپی نـەکردووە؟ پاشـان خـودا پەردەکە هەڵدەگرێت، سوێند دەخۆم بەگەورەیی خودا بۆ ئەوان شتێك نییە خۆشتربێت لە تەماشاکردنی بەدیهێنەری مەزنیان".

بیرتە لەسەرەتای ئەم کتێبەوە چیم پێ وتیت!:

**ئەگەر پرسیارێك لە ئارادا بێت بێگومان وەڵامێکی هەیە.**

# خودا چەند گەورەیە؟

واهەست مەکە لەبەرئەوەی بەباشی گوێم لێ دەگریت، یاخود بەباشی نووسینەکانم دەخوێنیتەوە ستایشت دەکەم، بەڵکو لەبەر گەورەیی و ژیری هەڵگری پرسیارەکەتە!

خودا دەزانێت گوێچکەکانت چەندین جار شایەت حاڵی ئەو وتەیە بووە کە دەڵێت:"خودا گەورەیە". بەڵام ئێستا دەپرسیت (ئایا چەند گەورەیە؟) هەوڵ دەدەم وەڵامی ئەم پرسیارەت بدەمەوە بەشێوەیەکی گونجاو و بەجۆرێك لەئاستی خۆتدا بێت و بێزارت نەکەم.

بەڵام دیسان دەبێت بەئارامیو پشودرێژییەوە ئەم بەشە تاکۆتایی بخوێنیتەوە.

سەرەتا پرسیارێك بۆ تۆ:

باڵای تۆ لەباڵای براکەت بەرزترە! باشە چەند بەرزترە؟.

بابڵێین باڵای تۆ (١٥٠سم)، باڵای براکەشت(١٠٠سم):

١٥٠–١٠٠=٥٠

کەوابوو باڵای تۆ (٥٠سم) بەرزترە لە باڵای براکەت. دۆزینەوەی بەرزی باڵای تۆ کارێکی ئاسان بوو، وانییە؟

بەڵێ ئاسانبوو. چونکە باڵای تۆمان لەگەڵ باڵای براکەتدا ئەنداز کرد. بەم جۆرە جیاوازی نێوانتانمان دیاریکردو وەڵامی پرسیاری (چەند گەورەیە)مان دایەوە:

"(٥٠سم)چەند دەبێت؟" ئەمەت پێ خۆش دەبێت: (٥٠سم دەکاتە نیو مەتر) یاخود دەتوانیت بڵێیت (٠,٠٠٠٥)کم!!!

ئێستاش وابزانم لەوە تێگەیشتویت کە:

بۆ دیاریکردنی (چەند گەورەیە)یەی هەر شتێك پێویستە ئەو شتە لەگەڵ دانەیەکی تردا ئەنداز بکەین.

بۆ وێنە: بۆ زانینی ئەندازەی درێژی باڵای تۆ لە باڵای براکەت پێویست بوو بەراوردێك بکەین لەنێوان باڵای هەردووکتاندا.

ئێستاش بابگەڕێینەوە بۆ بابەتەکەی خۆمان، پرسیارەکەمان چی بوو:

((خودا چەند گەورەیە؟))

فەرموو تۆ پێم بڵێ، دەتوانین لەگەڵ چیدا خودا بەراورد بکەین؟ تاکو بتوانین بڵێین"ئەوەندە گەورەیە!" بێگومان لەگەڵ هیچ شتێکدا!.

کەواتە پرسیارێکی وەکو"خودا چەند گەورەیە" ئەگەر خۆمان بیکەین یان لەلایەن کەسێکی دیکەوە لێمان بکرێت، سەرەتا دەبێت لەوە تێبگەین کە ئەمە پرسیارێکی هەڵەیە. بشزانین وەڵامی ڕاست بۆ پرسیارێکی هەڵە وەدەست ناخرێت هەروەك بەکلیلێکی هەڵە ناتوانین دەرگای ماڵەوە بکەینەوە.

تەنیا چارەمان دۆزینەوەی کلیلێکی گونجاوە، واتە پرسینی پرسیارێکی ڕاستەو بەشێوەیەکی ژیرانە، بۆ نموونە:

# گەورەیی خودا چلۆن گەورەییەکە؟

گەورەیی چیاکان، ئۆقیانوسەکان(زەریاکان)، کیشوەرەکان، گۆی زەوی، خۆر، کۆمەڵەی خۆرو گالاکسیەکان جیاوازە لە گەورەیی خودا.

پێش هەموو شتێك ئەو شتانەی ژماردمان لەچاو شتانی دیکەدا گەورەن و لەچاو شتانێکی دیکەدا بچوکن.

بەڵام خودا تەنیا گەورەیە.

بۆ وێنە باڵای تۆ لەچاو باڵای براکەتدا گەورەیە، بەڵام لەچاو باڵای باوکتدا گچکەیە. کەوابوو گەورەیی باڵات گەورەییەکی ڕاستەقینە نییە.

بەهەمان شێوە گەورەیی هەر کەرەستەیەك لە دەوروبەرماندایەو هەموو بەدیهێنراوێکی دیکەی ئەم گەردونەی تێیدا دەژین وەکو گەورەیی بالآی تۆ وایە.

چیاکان گەورەن بەلآم زەریاکان لەوان گەورەترن. گۆی زەوی گەورەیە، لەو گەورەتر خۆرە. خۆریش وەکو خۆی گەورەیە، بەلآم لەناو بۆشایی ئاسماندا ئەستێرە گەلێکی زۆر مەزنتر لەخۆر بوونیان هەیە.

هەڵبەتە ئەو خودایەی هەموو ئەمانەی بەدیهێناوە گەورەیە. بەلآم گەورەیی زاتی ئەو لەچەشنی گەورەیی چیا، زەریا، گۆی زەوی‌و خۆر نییە. لەبەرئەوەی ئەو شتانە لەچاو یەکتریدا گەورە یاخود بچوکن.

خوداش لە هەموو شتێك گەورەترەو شتێك نییە لەو گەورەتر.

## ئەقڵمان وێنای گەورەیی خودای بۆ ناکرێت

ئەم زەویەی ئێمە، بەوشکانی‌و ئاوو چیا زەبەلاحەکانیشەوە بەدەوری خۆردا دەخولێنرێتەوە. خۆر ملیۆنێك و سێ سەد هەزار جار لەزەوی گەورەترە. لە ناو ڕێگای کاکێشاندا(واتە ئەم گەلە ئەستێرەیەی کە کۆمەڵەی خۆرەی خۆیشمانی تیادایە)

دووسەد ملیار ئەستێرەی وەکو خۆر بگرە لەخۆریش گەورەتر بوونی هەیە. ئەوەندەی مرۆڤ توانیویەتی درکی پێبکات ، لەناو بۆشایی ئەم ئاسمانەدا دووسەدو پەنجا ملیار گەلە ئەستێرەی تری وەك گەلە ئەستێرەکەی خۆمان کەناسراوە بە(ڕێگای کاکێشان) هەیە.

ئەگەر ئەم گەردونەی تێیدا دەژین هێندە گەورە بێت کە ئاوەزمان وێنای بۆ ناکرێت، ئەی ئایا دەکرێت مێشکمان بتوانێت وێنای گەورەیی ئەو خودایەی بۆ بکرێت کە هەموو ئەم گەلە ئەستێرانەی گەردوونی بەدیهێناوە؟

## چۆن لەو"خودا گەورەیە" تێبگەین؟

ئەگەر پێیان وتی"سوڵتان محمد فاتح[١]" پیاوێکی گەورەبوو، چۆن لەم قسەیە تێدەگەیت؟ خۆ ناڵێیت:"سوڵتان محمد فاتح باڵای (٣٠)مەتر بوو، درێژی قۆڵەکانی (٥) مەتر بوو، ئەوە هەر باسی قاچەکانی مەکە هێندەی بەلەمێك گەورە بوو ...".

بێگومان وەها تێناگەیت، وانییە؟

---

١- سوڵتان محمد فاتح: یەکێکە لە پێشەواو خەلیفەی موسوڵمانان لە سەردەمی عوسمانیدا شاری (قوستەنتینیە)ی ڕزگارکردو ناوی نا (ئەستەمبوڵ). هەربۆیە نازناوی (فاتح)یان لێ نا.

ڕاوەستە، ڕاوەستە ! پەلەمەکە. گاڵتەت لەگەڵ ناکەم و هێندەش قسەی بێ مانا لەزارم نایەتە دەرەوە. ئەم قسە نامۆیانە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆو گرنگیان بەبابەتەکەی ئێمەوە هەیە.

کە دەڵێین"سوڵتان محمد فاتح" پیاوێکی گەورە بوو، مەبەستمان ئەوەیە خەلیفەیەکی مەزن بووە، کاری گەورەی وەك ڕزگارکردنی ئەستەمبوڵ کردووە کەڕێڕەوی مێژووی پێ گۆڕی، بەکورتیەکەی دەمانەوێت بڵێین پیاوێکی هێندە گەورە بوو ناوی لەسەر لاپەڕەکانی مێژوو دەدرەوشێتەوە. کەواتە وشەی گەورە ئەو مانایەی پێشوو نادات بەدەستەوە.

محمد فاتح و چیاکانیش گەورەن، بەڵام گەورەییەکەی شێخی مەزن زۆر جیاوازە لە گەورەیی چیاکان.

لەم نموونە سادەیەوە بۆمان دەرکەوت کە گەورە تا گەورە تەوفیری هەیە. کاتێك"دەڵێن خودا گەورەیە" وەك قەبارە، بیر لە گەورەیی زاتی ئەو مەکەرەوە، بەڵکو بیر لە گەورەیی ئەو شتانە بکەرەوە کە ئەو بەدیهێناون. چونکە ئەو خودایەی کە لە کاتێکدا هیچ شتێك بوونی نەبوو زاتی ئەو هەبوو لەهیچ شتێکی تر ناچێت. مێشکی ئێمە هەرگیز تونای وێناکردن و تێگەشتنی گەورەیی ئەو زاتەی نییە.

مـرۆڤ دەتوانێـت بنوارێتـە گـەورەیی بـەدیهێنراوان و لـەو ڕێگەیـەوە وێنـا بـۆ گـەورەیی بەدیهێنـەر بکـات بەشـێوەیەکی گونجاو.

یـەزدانێك لەهـەمان کاتـدا ملیارەهـا خانـەی لەشـی تـۆ کـار پێدەکات بێگومان مەزنە.

پـەروەردگارێك بەئەنـدازەی زەریـاو دەریاکـان ئـاو لـە سـکی هەورەکاندا ڕادەگرێـت و لەهـەر جێگەیـەك مـەیلی لێ بێـت دڵـۆپ دڵۆپ دەیبارێنێت بێگومان مەزنە.

خودایـــەك – لـــە کاتژمێرێکـــدا (١٠٨٠٠٠)کـــم واتـــە (٣٠کـم/چـرکە)گـۆی زەوی بـەدەوری خـۆردا هەڵدەسـوڕێنێت، بەدرێـژایی ئـەم سوڕانەوەیە تەنانـەت سـەری تاکـە پەپولەیـەك چییە ناسوڕێتەوە – بەدڵنیاییەوە زانای ڕەهاو گەورەیە.

ئەگـەر چـاو بکەیتـەوەو بـڕوانین هـەموو شـتێك گـەورەیی پەروەردگارت بۆ دەردەخەن.

فڕینی باڵندەکان، جموجوڵی مرۆڤەکان، ڕاکردنـی پڵنگـەکان، گـەورەبوونی درەختـەکان، مەلـەکردنی ماسـیەکان، کرانـەوەی خونچـەکان، هـەڵکردنی بایـەکان، درەوشـانەوەی ئەسـتێرەکان، زەردەخەنـەی سـاواکان، خۆشەویسـتی دایکـان، هاتنـە گـۆی منداڵـەکان... هـەموو شـتێك گـەورەیی ئـەومان نیشـان دەدات!

لەبەرئەوەی هەموو ئەمانە بەرهەمی موعجیزەیەکی گەورەن و بەدەر لە خودا هیچ هێزێکی تر توانای ئەم کارانەی نییە. بەڵێ خودا گەورەیە! توانای ئەو بەهەموو کارێک ڕادەگات، توانای ئەو گەورەیە، مەزنە! سنعەتی ئەو هەموو جوانیەك دەهێنێتە بوون، سنعەتی ئەو گەورەیە!

شەفقەتی ئەو ژیان دەبەخشێتە هەموو زیندەوەرێك، شەفقەتی ئەو گەورەیە.

ئەو هەموو کەسێك دەبینێت و چاو لێدەکات، بینینی ئەو گەورەیە.

ئەو هەموو دەنگێك دەبیستێت، بیستنی ئەو گەورەیە.

ئەو ئافرێنەری ئێمەیەو ئافرێنەرمان گەورەیە!.

# الله أكبر، الله أكبر!

هەموو ڕۆژێك كاتی نوێژەكان لە بڵندگۆی مزگەوتەكانەوە ئەم دەنگە دەبیستین:

الله أكبر، الله أكبر!

الله أكبر، الله أكبر!

نوێـژ خوێنـان بـەم (دەسـتەواژەیە) دەسـتدەكەن بـە نوێـژ خوێندن: الله أكبر.

الله أكـبر دەكـات و دەچـێتە ڕكوعـەوە، هەڵدەسـتێتەوە، الله أكـبر دەكـات و دەچـێتە كوڕنوشـەوە بـۆ خـودای خـۆی. دواتـر دیسان بە الله أكبر سەرەتای ڕكاتێكی نوێ دەست پێدەكات.

حاجیان بە الله أكبر سەلام لە خانـەی خـودا دەكـەن، لـەكاتی نوێژی جەژنەكاندا چەندین جار بەیەك دەنگ الله أكبر دەڵێن.

ئێمەی موسڵمان زۆرترین گوفتارمان الله أكبرە، لەكاتی ترسدا الله أكبر! لەكاتی شادیماندا الله أكبر! لەسـەر سـوڕماندا دەڵـێین الله أكبر!

لە زمانی شیرینی كوردیدا الله أكـبر واتـا (خـودا گەورەترینـە) بـەڵام نـەك بـەو واتایـەی كـە گـەورەی تـریش هـەن بـەڵام ئـەو گەورەترینیانە!

ئەگەر بیرت بێتەوە لە سەرەتای ئەم بەشەوە تائێستا ئەمەوێت ئەوەت تێبگەیەنم کە گەورەیی خودا ئەو جۆرە گەورەییە نییە کە ئێمە دەیزانین و بەگوێرەی هیچ شتێکی تر پێوانەی گەورەیی بۆ ناکرێت.

خودا گەورەیەو هیچ کەسێکی تر لایەقی گەورەییەتی ڕاستەقینە نییە بێجگە لەو.

# خـودا لـه کـوێیـه؟

خودا هەم لە هەموو شوێنێکەو هەم لە هیچ جێگایەك نییـە. لـەم بەشەدا واتاو لێکدانەوەی ئەم قسانەت بۆ ڕوون دەکەمـەوە کـە ئێسـتا مێشـکتی جـەنجاڵ کـردووە. بـەم شـێوەیەش دەتوانیـت وەلامی پرسیاری"خودا لە کوێیە"ت دەست بکەوێت.

بەنیسبەت ماسـییەکەوە دەرچـوونە دەرەوە لـە ئـاو کـارێکی ئەستەمە. با بڵێین ماسییەك هەیـە (ئـەقڵی) ژیریـی بەئەنـدازەی ژیرییەکـەی تـۆ دەبێـت. چـەند دەتوانێـت بـاتێبفکرێ ناتوانێـت وێنای ژیانی خۆی بکات لە دەرەوەی ئاوەکە، چـونکە لەوەتـەی هاتۆتە دنیاوە هەر لەناو ئاودا بووە، ئەقڵی تێپەڕی جـۆرە ژیـان و بوونێکی تر ناکات بەدەر لەوەی خۆی.

لەبەر نەزانینی، ئـەقڵ و هـۆش و ئەندێشـەی هـەردەم لەگـەڵ ئاودایە، بۆ ماسییەك شوێنێك لە دەرەوەی ئاو بوونی نییە.

هەر بەوێنەی ئـاو بـۆ ماسـییەکە، شـوێن و جێگاکـانیش هـەر وایـە بـۆ تـۆ. لەوەتـەی خۆتـت ناسـیوە هەمیشـە لـە شـوێنێکدا خۆتـت بینیوەتـەوەو هـیچ کاتێـك نـەبووە لـە هـیچ جێگایەکـدا نەبیت.

لە ماڵەوە، لە قوتابخانە، لە کۆڵان، لە باخچـەی ئـاژەڵان، لـە گوند، لـەناو دارسـتانەکە، لـەناو بـاخ و بێسـتانەکاندا یـاخود لـە شارو وڵاتی جیاواز جیاواز بوویت.

ئەگەر لێیان پرسیبێتیت"لە کـوێی؟" هـەموو کاتێـك وەڵامـت ئامادە بووە! چونکە دەبێت هەر لە جێگەیەك بیت.

ئەم ناچارییەی تۆ گەلێك زیاترە لەوەی ماسییەکە کـە ناچـار بـوو لــەناو ئاوەکــەدا بێــت. چــونکە ماســی نــاو فرنەکــەی چێشتخانەکەی نزیك ماڵی خۆتان لەدەرەوەی ئاوە، بەڵام ئێسـتا ئیدی بێگیانە.

هیچ کاتێك نەبووە تۆ لە جێگایەکدا نەبیت، هەر لەبەر ئەمەیە پرسیارێکی لەم جۆرە ئاوەزتی وروژاندووە:

"ئایا خودا لە کوێیە، ئەی نابێـت ئـەویش لەجێگایـەك بـوونی هەبێت؟"

ئەم پرسیارە لەڕاستیدا چەندین جار سەیرو سەمەرە ترە لەوەی ئەگەر ماسییەك لە تۆ بپرسێت (لە كام دەریادا دەژیت؟). پرسیاری (لە كوێ)، پرسیارێكە كە ئاڕاستەی بەدیهاتووانێك دەكرێت كە لە خانەو شانەو گۆشت و ئێسقان واتە لە مادە دروست كرابێتن.

"پێنووسەكەم لە كوێیە؟"

"ماڵی ئێوە لە كوێیە؟"

"ئەحمەد لە كوێیە؟"

"شاخی ئاغری[1] لە كوێیە؟"

"زەریای ئەتڵەسی لە كوێیە؟"

"مانگ لە كوێیە؟"

" هەسارەی موشتەری لە كوێیە؟"

چونكە هەر شتێك لە مادە دروست كرابێت پێویستی بەجێگایەك هەیە تێیدا بێت.

لەبەرئەوەی بەدیهێنەری مەزن لە هیچ یەكێك لە بەدیهاتووەكانی خۆی -كە پێك هاتوون لە مادە- ناچێت نەماددەیەو نەجەستە. بۆیە پرسیاری (لە كوێیە) لە بەرامبەر پەروەردگاردا پرسیارێكی دروست نییە، چونكە وەڵامێكی نییە.

---

١- شاخێكە لە وڵاتی توركیا.

خودا نیازی بەجێگایەك نییە تێیدا بێت، زاتی ئەو نیازی بەهیچ شتێکی لەو بابەتە نییە.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی بابەتەکە نمونەیەکت بۆ دێنمەوە تاکو کەمێکیش بێت دەرکی پێ بکەیت:

هەندێك لە بەدیهاتووانی پەروەردگار نەماددەیەو نەدەتوانرێت بەدەست بگیرێت و بەچاو ببینرێت، بۆ وێنە بیر لە (ژیان) ت بکەرەوە.

ئەگەر لێت بپرسم سییەکانت لە کوێدان، خێرا دەستت بۆ سنگت ڕادەکێشیت ... بەهەمان شێوە مێشکت، گورچیلەکانت، گەدەت ... شوێنی تایبەتی خۆیانیان هەیە. باشە ئەی ژیانت لە کوێدایە؟ تۆ بڵێی لەکام بەشی جەستەدا بێت؟!

ناتوانیت نیشانم بدەیت! چونکە ژیان ماددە نییەو لە لەشتدا جێگایەکی داگیر نەکردووە، مەجبوور نییە لە جێگایەکدا بێت. لە لایەکەوە لە هەموو شوێنێکی لەشتدایەو لە لایەکی تریشەوە لە هیچ شوێنێکی لەشتدا نییە ... لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەر شتێك چەند دوور بێت لەبوونی ماددی، وەڵامدانەوەی پرسیاری (لە کوێ) بۆ ئەو شتە هێندە ئەستەمتر دەبێت، هەتا ئەوەندە بێ مانا دەبێت وەك ئەوەی پێت بڵێن:"ژیانت لە کوێتدایە، نیشانم بدە".

ئەگەر بۆ ئەو شتانەی خودا بەدیهێناون و بوونێکی ماددییان نییە گونجاو نەبێت بپرسین"لە کوێدایە"، یاخود بشپرسین بەڵام نەتوانین وەڵام بدەینەوە، ئەوا سەبارەت بەخودا پرسین و وەڵامدانەوەی هەرگیز گونجاو نییە.

## لە هیچ شوێنێك و لەهەموو شوێنێك

ئاسمان، ئەستێرەکان، زەوی، دەریاکان، دارستانەکان، کیشوەرەکان واتە هەموو شوێنەکان تێکڕا بەدیهاتووی بەدیهینەری مەزنن. ئەمانە پیشتر بوونیان نەبوو، بەڵام خودا هەر هەبوو، کەواتە خودا ئەوکاتە لە هیچ جێگایەکدا نەبووە چونکە هیچ جێگایەك بوونی نەبوو.

بەڵێ لەسەرەتای ئەم بەشەدا پێم ڕاگەیاندی کە خودا لە هیچ شوێنێکدا نیە، وابزانم هەتا ئێرە ئەمەت لا ڕوون بووەوە.

بەڵام ئێستا دەپرسیت ((ئەی چۆن دەکرێت لە هیچ شوێنێکدا نەبێت بەڵام لەهەمان کاتدا لەهەموو شوێنێکیشدا بێت؟)) نموونەیەکی سادەت بۆ دێنمەوە، دەتوانیت ئەم نمونانە بەدووربینێکی بەهێز یاخود تەلەسکۆبێك بزانیت کە تەنە زۆر دوورەکانت بۆ نزیك دەکاتەوە.

شتانێك کە چاوی ژێریمان ناتوانێت بە ئاسانی بیانبینێت بەهۆی هاوێنەی (عەدەسەی) ئەم تەلەسکۆبەوە (واتە نمونەکان) دەتوانێت بیانبینێت، لەبەرئەوە نمونەکان گرنگن.

ئێستا بیر لەخۆر بکەرەوە، هەموو بەری بەیانێك گۆی زەویمان بۆ ڕوناك دەکاتەوە و وەکو مۆمێکی گەورەی ئەرك پێسپێراو کاردەکات.

کە ڕۆژدادێت هەموو جێگایەك ڕووناك دەبێتەوە، خۆر خۆی لەهەموو جێگایەك نیشان دەدات، سەیری هەرکوێیەك بکەیت وا هەست دەکەیت خۆرێکی لێبێت.

لەسەر شەونمی کوڵمی گوڵەکان لە سپێدە فێنکەکاندا.. لەسەر ڕووی ئاوی بەخوڕی دەریاکاندا.. لەپەنجەرەی ماڵەکاندا.. لەچاوی مرۆڤەکان، پشیلەکان و باڵندەکان...

خۆر هەموو کەسێك و هەموو شتێك ڕووناك دەکاتەوەو لە ئاوێنەی هەموو کەس و شتێکدا خۆی نیشانی بینەرانی دەدات.

باشه لەڕاستیدا خۆر لەکوێدایە؟

لەئاسماندایە!

بەڵام ((ئەگەر بڵێین هەم بەڕووناکییەکەی و هەم بەگەرمییەکەی پارچەیەك لە خۆر لەسەر هەموو کەس و شتێك بوونی هەیە)) هەڵەمان نەکردووە، لەڕاستیشدا خۆر لەهەموو جێگایەکە کەتێیدا دەدرەوشێتەوە، بەڵام لەهیچ یەکێك لەو جێگایانەشدا نییە.

هەروەك چۆن خودی خۆر لەبۆشایی ئاسماندایەو بەملیۆنەها کیلۆمەتر لەزەویەکەمانەوە دوورە وەلێ بەڕووناکیو گەرمییەکەیەوە لەپەنجەرەکاندایە، لەهەموو چاوەکاندا، لە دەنکۆڵەکانی لمی قەراغ دەریاکاندا، لەدڵۆپەکانی باراندا، لە کلووە بەفرەکانداو لەئەسرینی چاوی منداڵاندا دەدرەوشێتەوە، بەڵام لە هیچ کام لەو شوێنانەدا بوونی نییە، خوداش بە قودرەت و شەفقەت و میهرەبانیو زانستی ڕەهای خۆی لە هەموو شوێنێکدایە بەڵام زاتی پیرۆزی مەزنی ئەو لەهیچ جێگایەکدا نییە...

# ئەدی کێ خودای بەدیهێناوە؟

بەر لەهەفتەیەك پێش ئێستاماڵی خزمێکمان میوانمان بوو، کچێکی خنجیلانەو جوانی تەمەن (٤–٥) ساڵیان هەبوو. سێوێکی سوری گەورەی لەدەست گرت و هەر وەك سمۆرە بەددانەکانی پێشەوەی کەلی دەکرد. لێم پرسی:

– خودا چەند سێوگەلێکی جوانی بەدیهێناوە، وانییە؟

وازی لەقەپالگرتن لە سێوەکە هێناو وتی:

– ئەم سێوەش خودا دروستی کردووە؟

وتم: "بەڵێ وەکو هەموو میوەکانی دیکە ئەم سێوەش خودا بەدیهێناوە، ئەویش بۆ ئەوەی تۆ بیخۆیت.." بەڵێ دوای ئەم قسەیە لێشاوی پرسیار بەرەورووم هات، گەر وردبیتەوە، دەزانی کۆتاییەکەی بەرەو کوێ دەچێت.

– ئەی پرتەقاڵەکە

– پرتەقاڵەکەش خودا بەدیهیناوە!

– گێلاس چی؟

– ئەویش خودا بەدیهێناوە!

– فستق؟

– فستقیش...

– هممم، هەرمێش، لالەنگیش؟

– ئەی، ئەی هێن، ئا! ئەی شوتی؟ کچۆڵەکە لەبەرئەوەی میوەی تری بەبیردا نەهات لەجیهانی ڕووەکەوە گواستیەوە بۆ جیهانی ئاژەڵان.

– باڵندەکان؟

– خودا هەموو باڵندەکانی هێناوەتەبوون.

– لەق لەقەکان؟

– بەو پێیەی لەق لەقیش باڵندەیە، خودا ئەویشی هێناوەتە بوون!

– مراوی؟

– ئەوانیش هەروەها!

هـەموو باڵنـدەكانی بـۆ ڕیـز نـەكرا بـەڵام هەرچـۆنێك بێـت بەردەوام بوو لە پرسیارەكان:

– هەورەكان؟

– خودا هەورەكانی ئافراندووە.

ئەم پرسیارو وەڵامانـە ئـەوی كـەیفخۆش دەكـرد، بـەر لەهـەر پرسـیارێك بەئەندازەیـەك پێدەكـەنیو وەك ئـەوەی بڵێیـت تـاكو دێت مـن زیـاترو زیـاتر لەگۆشـەیەكدا گـەمارۆ دەدات خۆشـحاڵتر دەبوو، چیتر بابەتەكەی خسـتبووە بـابی گاڵتەوگەپـەوەو كـەس نەیدەتوانی بێدەنگی بكات:

– درەختەكان؟

– چیاكان؟

– ئەی ماسیەكان؟

– مرۆڤەکان؟

– سەگەکان؟

– دۆلفینەکان؟

– قژ؟

– دایك و باوکم؟

– داپیرو باپیرم؟

دوای ڕیزکردنی ئەوانە، ئەوەی کەمن دەمێك بوو چاوەڕوانی بیستنی بووم پرسی:

– باشە! مامە، خودا هەموو شتێکی هێناوەتە بوون، ئەی، ئەی، ئەی، باشە کێ خودای هێناوەتە بوون؟ دەی فەرموو!

بێگومان وەلامێکم بۆ وتن هەبوو بەلام گرنگ ئەوە بوو بەجۆرێك ڕێکیخەم ئەو کیژە چکۆلەیە لێی تێبگات.

من لە سەروبەندی ئامادەکردنی وەلامەکەدا بووم لە مێشکی خۆمدا، باوکی کچە خۆیی تێهاویشت:

–ئای کچم، ئەوە چۆن پرسیارێکە دەیکەیت؟ واز لە مامت بێنە! کچە چکۆلەکە نیازی نەبوو دەست هەلگرێ، باشتر، بادەست هەلنەگرێ. ڕووی کردە باوکی و وتی ((چیبکەم ئاوا هات بە مێشکمدا)).

هــەر ئەوەنــدە! مــادەم پرســیارێك مێشــكی كیژۆڵەكــەی وروژاندبوو دەبوو هەر بكرایە، ئەو چی بكات تازە كارەكە وای لێهات.

دەستی نەرمونۆڵیم گرت و هێنامە لای خۆمـەوە، چاوم بڕیـە چاوی و وتم:

((ئافەرین، تۆ چەند كچێكی زیرەكیت!)) بڕێك بـە قەشـەنگی چاوە تەڕەكانیو قژە كاڵەكەیدا هەڵمدا. وەكو هـەموو منـداڵێكی دیكە كەمێك شەرمی كردو پاشان كەوتە نازكردن. ئێ دوای ئـەم هەموو پیاهەڵدانە هەردەبوو گوێ بۆ قسەكانم هەڵبخات:

((بڕوانــە خــودا هــەموو ئــەو شــتانەی دروســتكردووە كــە باسمانكردن، بـەڵام كـەس خـودای بەدینـەهێناوە چـونكە خـودا بەدیهێنەرەو بەدیناهێنرێت)).

وەڵامەكەم كورت بوو، بەڵام واهەستم كرد بەس بێت! چونكە پرسـیارەكەی ئـەویش هـەتا بڵێیـت كـورت بـوو. بـۆ منـداڵێكی تەمەن٤ ساڵ سەروزیادیش بوو.

– همممم...

ناســكۆڵەكە ئیــدی پرســیاری لێنــەكردم، دەســتیكردەوە بەكرمانـدنی مـاوەی سـێوەكەو چـوو بـۆ ژووری كوڕەكـەم تـاكو یاریەكانی ببینێت.

وەڵامەکەم ئەوی ئاسودەکرد. هیچ نەبێت بۆ ئێستای...

دەزانم ئەو وەڵامەی بەومدا بۆ تۆ بەس نییە.

لەوەش گەیشتوم بەدرکاندنی پرسیارێکی ئاوا مێشکتم وروژاندوە، لەبەرئەوە دۆزینەوەی وەڵامێکی شیاو و دڵنیاکەرەوە ئەرکی منە، وانییە؟

گەر بڕوانیت ئەو وەڵامە بۆ ئەو تەمەنە باش بوو ((خودا بەدیهێنەرە بەڵام ئەو بەدینەهێنراوە)).

دەڵێی تۆ بۆ ڕازیکردنی مێشکت بەو وەڵامە، دەتەوێت گوێبیستی نموونە گەلێك بیت.

باشە! دوو نموونە هەیە لە کتێبێکدا خوێندمەوە کە زۆر جوان و بڕواپێکەرە:

زەوی ڕوناکی لەکوێوە وەردەگرێت؟

بێگومان لەخۆرەوە!

مانگ ڕوناکی لەکوێوە وەردەگرێت؟

ئەویش لەخۆرەوە!

مارس چی؟

لەخۆرەوە.

زوهرە، مەریخ، بلۆتۆ؟

لەخۆرەوە، لەخۆرەوە، لەخۆرەوە،

باشە خۆر ڕوناکی لەکوێوە وەردەگرێت؟

سەیرە بەلاتەوە؟

پرسیارەکەم دووبارە دەکەمەوە.

خۆر لەکوێوە ڕوناکی وەردەگرێت؟

بێگومان لە هیچ کوێوە!

چونکە خۆر خودی خۆی سەرچاوەی ڕوناکییە.

ئەو هەموو هەسارەکان ڕووناك و گەرم دەکاتەوە، بەڵام خۆی ڕووناکی و گەرمی لەشوێنێکی دیکەوە وەرناگرێت.

بەڵێ بێمانا بوونی پرسیاری ((خۆر لەکوێوە ڕوناکی وەردەگرێت)) هیچ نییە لەچاو بێ مانا بوونی پرسیاری ((کێ خودای بەدیهێناوە))!

نموونەیەکی تر لە هەمان کتێبەوە:

شـەمەنەفەرێکی (١٠-١٥) فـارگۆنی بێنـە بەرچـاوت، هـەر دانەیەك لـەو فارگۆنانـە ئـەوەی دوای خـۆی ڕادەکێشـێت، بـەڵام سەبارەت بەبزوێنەر(لۆکۆمۆتیڤ)ەکە ناکرێت بپرسین گوایە (کێ بزوێنەرەکە ڕادەکێشێت!) چونکە گەر بزوێنەرێك نـەبێت هـەموو فارگۆنـــەکان ڕابکێشـــێت وەلێ خـــۆی ڕانەکێشـــرێت ئـــەوا شەمەندەفەرەکە ناتوانێت بڕوات.

هـەموو ئـەم پرسـیارە سـادەو سـاکار، بـەڵام ڕێنیشـاندەرانە بەڵگەی ئەوەن حەق وایە پرسیاری ((کـێ خـودای بـەدیهێناوە)) هەر نەکرێت پـاش ئـەوەی بەباشـی بیرمـان لـە بـەدیهاتووەکانی بەدیهێنەری مەزن کردەوە!

## بۆقێك لەسەربانێکەوە دەکەوێتە خوارەوە

لـەقۆناغی ناوەندیـدا بـووین، ڕۆژێـك مامۆسـتای ئـەدەبمان هۆنراوەیەکی سەیری لەسەر تەختە ڕەشەکە نووسی. تەواو بیرم

نییە هۆنراوە بوو یان شتێکی دیکە بەڵام ئەوەندە دەزانم دوای ئەو هەموو ساڵە چەند دێڕێکی هەن هەرگیز لەبیریان ناکەم و هەمیشە لەیادمن، دەڵێ:

- بۆقێك لەسەربانێکەوە کەوتە خوارەوە.

کلکی لەرزاندەوە!

جەندرمەیەك ئەوەی بینی.

وتی: ((لەسەر کێلی قەبرم بنووسن)).

بۆقێك لەسەربانێکەوە کەوتە خوارەوە،

کلکی لەرزاندەوە!

جەندرمەیەك ئەوەی بینی

وتی: ((لەسەر کێلی قەبرم بنووسن)).

بۆقێك لەسەربانێکەوە کەوتە خوارەوە،

کلکی لەرزاندەوە!

جەندرمەیەك ئەوەی بینی.

وتی: ((لەسەر کێلی قەبرم بنووسن)).

بۆقێك لەسەربانێکەوە کەوتە خوارەوە،

کلکی لەرزاندەوە!

جەندرمەیەك ئەوەی بینی.

وتی: ((لەسەر کێلی قەبرم بنووسن)).

بۆقێك لەسەربانێكەوە كەوتە خوارەوە،

كلكی لەرزاندەوە!

جەندرمەیەك ئەوەی بینی

وتی: ((لەسەر كێلی قەبرم بنووسن)).

بۆقێك لەسەربانێكەوە كەوتە خوارەوە،

كلكی لەرزاندەوە!

باشە، باشە ئیدی ئەیبڕمەوە. تێگەیشتیت چەندین ساڵە بۆچی ئەم (بۆق) و (جەندرمەیەم) بیرنەچۆتەوە؟ چونكە شتێك نییە لەبیربچێتەوە!

بابزانین ئەم گاڵتەوگەپە چ پەیوەندیەكی بەبابەتەكەی ئێمەوە هەیە؟

پرسیارەكەمان چی بوو؟

((كێ بەدیهێنەری بەدیهێناوە؟))

دەی بابڵێین وەڵامێكمان بۆ ئەم پرسیارە هەبوو، ئەو كات كاكی پرسیاركەر دەپرسێت:

((ئەی كێ ئەوی بەدیهێناوە؟)) بابڵێین وەڵامی ئەم پرسیارەمان دایەوە.

پرسیاركەر پرسیارێكی تری ئامادەیە:

((ئەی ئەو؟))

((ئەوی تر چی؟))

"ئەی باشە ئەوەی لە پێش ئەوەوە هات؟"

بەم شێوەیە بابەتەکە درێژ دەبێتەوەو تاکو ناکۆتا بەردەوام پرسیارەکان بەبێ وەڵامێکی دروست دەمێننەوە.

"بۆقێك لەسەربان کەوتە خوارەوە،

کلکی لەرزاندەوە!

جەندرمەیەك ئەمەی بینی...."

بەڵێ ئەم دووبارە کردنەوەیە پەیوەندیەکەی بە بابەتەکەی ئێمەوە ئەوەیە، زۆر بێمانایەو هەرگیز ناگاتە ئەنجامێك!

ئێستا با ئەو وەڵامەی بە کچە چکۆڵەکەم دا بەبیرخۆمانی بهێنینەوە: ((خودا هەموو ئەو شتانەی بەدیهێناوە کە باسمان کرد، بەڵام کەسێك ئەوی بەدینەهێناوە، چونکە ئەو خودایە)).

بەڵێ خودا بەدیهێنەرە، بەدیهاتوو نییەو بێباکە لە وەها بابەتێك.

مادەم خواوەند بەدیهێنەرە، هەر ئەو خودامانە. کەوایە پرسیاری ((کێ خودای بەدیهێناوە؟)) بێ وەڵامە چونکە ئەو بەدیهێنەرەو بەدیهێنەریش بەدی نایەت لەلایەن کەسێکی دیکەوە. بڕوانە پەروەردگارمان لە قورئانی پیرۆزدا چلۆن باسی خۆیمانی بۆ دەکات:

" بڵێ: خودا تاقانەیە. هەموو شتێك لە هەموو بارێكدا پێویستی بەخودایە، ئەو نیازی بەهیچ كەسێك نییە.ئەو لەدایك نەبووەو كەسێك ئەوی نەهێناوەتە دنیاوە. هیچ كەسێك هاوتای ئەو نییە"سورەتی الإخلاص: ١-٤.

بەرلەوەی خودا ئەم سورەتە بۆ پێغەمبەرمانﷺبنێرێت ئەزانی چی ڕوویدابوو؟

كەسێك هاتە لای حەزرەت و لێی پرسی: ((ئەگەر خوا هەموو شتێكی ئافراندووە، ئەی كێ خودای ئافراند؟)).

ئەوان منداڵ نەبوون بەڵكو پیاوگەلێكی بەتەمەن بوون، پێغەمبەرمانﷺ دڵگران بوو لەوەی كە ئەو پیاوە بەتەمەنانە لەگەڵ ئەوەی دەیانزانی بەڵام ئەو پرسیارەیان كرد.

خوای گەورەش بۆ وەڵامدانەوەی ئەو كەسانە ئەم سورەتەی بە حەزرەتی جبریل(سەلامی خوای لێبێ)دا ناردەخوارەوە.

# بوونی خودا چلۆن بوونێکه؟

تامەزرۆبوونی تۆ بۆ خوداو پرسیارکردنت دەربارەی ئەو بەبێ ترس و دڵەڕاوکێ کارێکی زۆر باشەو جێگای ڕێزە. زۆر جاران دەڵێم تامەزرۆبوون و بەدواداچوونی کەسێك بۆ خودای خۆی کارێکی زۆر ئاساییە. بەپێچەوانەوە بەدوادانەچوونی کارێکی نامۆیە.

مرۆڤ دەبێت بەتاسەی ناسینی خودای خۆی بێت و هەوڵ بۆ ناسینی بدات. زاتێکی چۆنە؟ بۆچی ئێمەی بەدیهێناوە؟ چی لە ئێمە داوادەکات؟ چۆن دەتوانین ئەو باشتر بناسین و بۆ ئەو هەموو شتە جوانەی بەئێمە بەخشیوە چۆن دەبێت سوپاسی بکەین.. ئەم پرسیارانەو چەندین پرسیاری تر هەیە دەبێت بکرێن و بەدوای وەڵامدا بگەڕێین...

بەڵێ نابێت ئەو خاڵەمان بیربچێت: کە ئەقڵی ئێمەش سنورێکی هەیە. توانای تێگەیشتنمان هەتا جێگایەك هاوڕێمانەو لەسنوری خۆی ناکاتە ئەوبەرەوە.

من کاتێك لە تەمەنی تۆدا بووم کۆمەڵە کتێبێکم خوێندەوە کە زۆر مێشکیان جەنجاڵ کردم، هەرچەندە هەوڵم دەدا نەمدەتوانی وەڵامێکی ڕازیکەر بۆ پرسیارەکانم چنگ بخەم.

حەزم دەکرد خودا بناسم.

ئەو کەسێکی چۆنە؟

لەچی دەچێت؟

لەکوێیە؟

لەو سەردەمەدا کتێبێکم نەبوو وەڵامی ئەمانەی تێدا بێت، واتە بەقەد تۆ بەختم باش نەبوو! هەروەها کەسێکیشم نەدەناسی وەڵامم بداتەوە...

ئەوە هات بەبیرمدا کە:"مادەم ئەقڵم وێنای خودای بۆناکرێت ئیدی بۆچی بڕوای پێ بهێنم!؟ بەڵێ وایە، ئایا بڕوانەکردنی مرۆڤ بەبابەتگەلێك ئەقڵی تێپەڕی ناکات شتێکی ئاسایی نییە؟"

ڕۆژێکیان لە ماڵەوە بەتەنیا بووم. لەلای پەنجەرەکەوە دانیشتبووم. تەماشای سەماو هەڵبەزو دابەزی پەلی درەختی باخچەکەمانم دەکرد، کە بەدەست ڕەشەباوە دەیناڵاند.

لەپڕ کۆمەڵێك پرسیارم لا دروستبوو:

من لەکوێم؟

لەژوورەکەمدا ..

ژوورەکەم لەکوێیە؟

لەناو ماڵەکەماندا!

ماڵمان لەکوێیە؟

لە کۆڵانی خۆمان.

ئەی کۆڵانی خۆمان؟

لەگەڕەکەکەدایە، لە بازاڕی ئادایە.

بازاڕی ئادا؟

لە تورکیایە

تورکیا؟

بێگومان لە شوێنێکی سەر زەوییە، دەبێ لە کوێی تر بێت!

زەوی؟

لە کۆمەڵەی خۆردایە!

کۆمەڵەی خۆر؟

لەناو گالاکسی (ڕێگای کاکێشاندایە)!

باشە ڕێگای کاکێشان دەکەوێتە کوێوە؟

لە ئاسماندایە..

ئەی ئاسمان؟

ئاسمان؟

بەڵێ ئەوەی ناوی دەنێین بۆشایی ئاسمان، ئەو لەکوێیە؟

نازانم لەوانەیە ئەویش لە ناو ئاسمانێکی تردا بێت.

ئەی ئەو ئاسمانەی تر لەکوێیە؟

هیین، مێشکم ئاڵۆزبوو، کەس وەڵامی ئەم پرسیارە نازانێت ئیدی!

ڕاستە ئەمەیە وەڵام! ئەقڵی هیچ کەسێك تێپەڕی ئەوە ناکات؟

ژیری مرۆڤ ناتوانێت وەڵامی چەند پرسیارێك بداتەوە وەك:"بۆشایی ئاسمان لەکوێیە؟ ئەگەر شوێنێك هەبێت بۆشایی ئاسمانی لەناودا بێت ئەو لە کوێیە؟...

بۆیە مادەم ئەقڵم گەورەیی ئەو زاتەی بۆ هەڵناگیرێت نابێت نکوڵی لێ بکەم.

هەندێ شت هەیە هیچ کاتێك ئەقڵم تێپەڕی ناکات.

هەندێك شت هەیە ئەقڵی هیچ کەسێك تێپەڕی ناکات.

هەندێك شت هەیە گەر بێتوو ئەقڵی هەموو مرۆڤایەتی یەكبگرێت هێشتا ناتوانێت لێی تێبگات.

لەبەرئەوە مادەم ناتوانین پەی بەئەم دونیایەی تێدا دەژین بەرین، ئەی بەئەقڵی كێ گونجاوە بتوانین بەتەواوی پەی بەخودایەك بەرین كە ئەم گەردوونەی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون، واتە كاتێك هیچ شتێك بوونی نەبوو ئەو هەبووە.

من ئەو كاتە هەوڵم دەدا ئاوی زەریایەكی گەورە بخەمە ناو پەرداخێكی بچكۆلەوەو جێگەی بكەمەوە، ئایا ئەمە دەكرێت؟ ...

ئەمڕۆ ئەو ڕووداوانەم بیركەوتەوە وتم: ((مرۆڤ لەتەمەنی گەنجێتیدا زۆر بەخۆیدا دەنازێت)). چونكە بۆ زانینی سنوری ژیری خۆم نیازم بەوە نەبوو لەسنوری بۆشایی ئاسماندا بگەڕێم. ئەوە بەس بوو لەكاسەی سەری خۆمدا بمێنمەوە.

هێشتا نەمدەزانی مێشكی مرۆڤ "كە لە ملیارەها خانەی دەماریی پێكهاتووەو پێكەوە بەهەماهەنگی دەستیی یەكیان گرتووە" چۆن كاردەكات.

ژیری مرۆڤ هێشتا لە مێشك و ژیریی خۆی تێنەگەیشتبوو واتە ئەقڵمان تێپەڕی ئەقڵمانی نەدەكرد!

ئەگەر بەبیانووی ئەوەی ئەقڵمان تێپەڕی ناکات نکوڵی بکەین دەبێت پێش هەموو شتێك نکوڵی لەبوونی ئەقڵی خۆمان بکـەین. چونکە ئەقڵمان تێپەڕی ئەویش ناکات!

له چەند ساڵی داهاتوودا دەرکم بەوە کرد چەندین بابـەتی تـر هـەن ئـەقڵم نایانپێکێـت و وێنـای بـۆ ناکرێـت، لەوانـە "ڕۆح و ژیان".

ئێمـە نـاتوانین لـە نـزیکترین شـتانی خۆمـان کـەڕۆح و ژیانـە بەباشـی تـێ بگـەین، ئـەی چـۆن دەتـوانین بـەم ئەقڵـە سنوردارەمانەوە لە زاتی یەزدانی مەزن تێبگەین!؟

خۆ خودا داوای ئەوەمان لێناکات هەوڵبدەین لە زاتی ئەو تـێ بگەین، بەڵام دەکرێـت لـەڕێگای تێڕوانینـی بەدیهاتووەکانییـەوە ئەو بناسین، لە بوون و یەکتایی ئەو تێبگەین، بـزانین ئـەو چۆن خودایەکەو سیفەتەکانی چۆنە.

خودا لەبەرئەمە ئێمەی هێناوەتە بوون.

لەسەرمان پێویستە ئەو بناسین، خۆشمان بوێت و پەرستشی بۆ بکەین.

# گەردوون پەرتووکێکە !

سێ دانە پێشەوای گەورە هەن پەروەردگارمان پێدەناسێنن، یەکەم: پێغەمبەرمانﷺ، دووەم: قورئان و سێیەمیشیان: گەردوونە.

وەرە باپێکەوە لەم وەرزی بەهارەدا چاو بەچەند لاپەڕەیەك لەکتێبی گەردووندا بخشێنین. بابزانین ئەم پەرتووکە زەبەلاحە دەربارەی یەزدانمان چییمان پێدەڵێت، ببینین و فێرببین.

ئەم پەرتووکەی گەردوون لاپەڕەکانی بەژماردن و دێڕەکانی بەخوێندنەوە تەواو نابێت. با بڕوانیینە یەك دوو دێڕی سادەی یەك دوو لاپەڕە.

سەیرکە ئاسمان گەورەترین و سەرنجڕاکێشترین لاپەڕەی ئەم کتێبی گەردوونەیە.

بەپەردەی ڕەشی شەوی‌و ملیارەها ئەستێرەی قەشەنگەوە چەند جوان ڕازێنراوەتەوە !

نەپەتێك و نەمێخێك ئەو ئەستێرانەی ڕاگیرکردووە، لە کاتێکدا خێمەیەکی بچوکیش بەبێ بوونی مێخ ڕاگیرنابێت.

ئەوە خودایە کە هەموو ئەوانەی لە بۆشاییدا ڕاگیرکردووەو بەبێ ئەوەی بەیەکدا بکێشن لە خولگەکانیاندا دەیانسوڕێنێتەوە.

بەڵێ ئەم لاپەڕەیە بەئەستێرەکانیەوە توانستی ڕەهاو بێکۆتای پەروەردگاری مەزنمان بۆ بەیان دەکات.

وەرە با ئێستا سەیرێکی ڕووی زەوی بکەین.

لەم وەرزی بەهارەدا ڕووی زەوی وەکو فەرشێکی گەورەی لێهاتووە بەباخ و باخات و کێڵگەو گوڵ و نێرگس ڕازێنرابێتەوە.

لاپەڕەی بەهاریش بە هەموو گوڵ و گوڵزارە یەك لە یەك جوانترەکانییەوە بەشێك لە کارسازیو سنعەتی موعجیزەیی بەدیهێنەرمان بۆ دەردەخات.

ئەگەر چاو بکەینەوەو بەباشی ئەم لاپەڕە گوڵدارە بخوێنینەوەو بەوردی لێی بڕوانین شتێك لە ناخمانەوە هانمان نادات بڵێین"خوداوەندا گەر دروستکراوانی تۆ ئەوەندە جوانبن ئەی ئایا دەبێت خۆت چەندە جوان و جوانکار بیت"؟!

با خێرا لاپەڕەکە هەڵنەدەینەوە سەیرێکی ئەو میوە تەڕو تازانەی سەر پەلی درەختەکان بکەین.

سێو، گێلاس، هەرمێ گولاوی، هەناری هەمە تام و قەبارە جیاواز...

دەبینی هەموو ئەو میوانە لەسەر پەلی درەختەکانیانەوە – لەڕێگای ڕەگەکانیانەوە ئاوێکی قوڕاوی دەخۆنەوە– بەشێوەیەکی ئامادەکراو پێشکەشمان دەکرێت!

ئەمانە لە لایەکەوە خۆشەویستی بێپایانی پەروەردگار بۆبەندەکانی پیشان دەدات و لە لایەکی دیکەشەوە ئەو شەفقەت و بەزەییو خۆشەویستییە گەورەیەی ئەو لە بابەت بەخێوکردنی زیندەوەرانەوە ئاشکرادەکات. ئەگەر خودا بیویستایە دەیتوانی بەو شێوە قوڕاویە بەخێومان بکات.

بڕوانە ئەو ئاژەڵانە، چەندە ژمارەیەکی زۆر ئاژەڵ هەیە لەم لاپەڕیەدا؟! دەیانبینیت؟

ئەو مانگایانەی خۆیان گژوگیا دەخۆن و شیرێکی ساف و بێگەردو بەسودمان دەدەنێ، هەنگی هەنگوینندەر، باڵندە کۆچکەرەکان بەباڵ دەفڕن و بەئاسانی گەرمیان و کوێستان دەکەن.

ئایا بوونی ئەم ئاژەڵانە گەورەیی دەسەڵاتی یەزدانی مەزن ناخەنە پێشچاو؟. بڕوانە کۆمەڵێکیان خاوەن بێچوون، چەند بەووردی ئاگاداری بێچووەکانیان دەکەن. دڕندەترینیان کەمترین ئازاری بێچووەکانیان نادەن.

کەوایە لە دڵیاندا بەزەییو میهرەبانی هەیە. کەوایە ئەو خودایەی ئەوانی هێناوەتە بوون بەخشندەو میهرەبانە.

ئێستاش با سەیری یەکێك لە قەشەنگترین لاپەڕەکانی ئەم پەرتووکە بکەین، با ئاوێنەیەك بهێنین و تەماشای ڕوخسارمان بکەین. لە سەرزەوی ملیارەها مرۆڤ هەن و هەمووشیان ڕوخساریان هەیە، کەچی هیچیان لە گەڵ ئەوی تردا یەکسان نییە. دەبینین لە ڕووبەرێکی بەقەد ناو لەپی دەستێکدا لوتێك، دوو چاو، دوو گوێچکەو لێوێکی نەخشاندووە، لەسەر شێواز گەلێکی جیاوازی بەئەندازەی ژمارەی مرۆڤەکان.

لاپەڕەی ڕوخسار هەزارەها هونەری بەدیهێنەری گەورەمان نیشان دەدات. بۆ نموونە، خودایەك دوو چاوی بەئێمە بەخشیووە تاکو پێی ببینین بێگومان خودی خۆی بینایە، خودایەك دوو گوێچکەی بەئێمە بەخشیوەو ئێمەش چەندین دەنگی پێدەبیستین بێگومان خودی خۆی هەموو دەنگێك دەبیستێت.

بەڵێ بەم شێوەیە گەردوون بەلاپەڕە ئەژمار نەکراوەکانیەوە، بەدێڕە بێکۆتاییەکانیەوە گەلێك وانەو ڕونکردنەوەمان پێدەڵێت دەربارەی ئەو پەروەردگارەی کە دەمانەوێت بیناسین و زانیاری زیاترمان هەبێت دەربارەی.

گەردوون پەرتووکێکی گەورەیە، ئێمەش پێویستە بیخوێنینەوەو لە دێڕەکانیدا هەوڵبدەین بەدیهێنەری جیهانیان بناسین.

ئەگەریش ئەقڵمان تێپەڕی گەورەیی زاتی خودا نەکات، دەتوانین لەوە تێبگەین کە ئەو چلۆن زاتێکەو کاتێکیش ناسیمان زیاتر خۆشمان دەوێت.

# بۆچی خودا یەکتایە؟

لەبەرئەوەی بێجگە لە (الله) خودایەکی تر نییە، ئەو یەکتایە.

گرنگترین بنەمای دینی ئێمە –ئیسلام– یەکتایی خودایە، بەمە دەڵێن (تەوحید).

لە دینی ئێمەدا هەموو شتێك لە باوەڕهێنان بەیەکتایی خوداوە دەستپێدەکات.

لە وڵاتێکدا دوو سەرۆك نابێت. لە شارێکدا نابێت دوو سەرۆکی شارەوانی هەبێت. هەتا ئەو ڕادەیەی لە گوندێکدا ناکرێت دوو موختار هەبێت. ئەگەر هەبووایە بارودۆخ تێکدەچوو ئەو کات یەکێکیان بیوتایە (وەرە) ئەوی دی دەیوت (بڕۆ)و بەپێچەوانەشەوە.

لەو نموونانەوە دەبێت لەوە تێگەیشتبیت گەر کارێك لە بەڕێوبەرێك زیاتری هەبوو تێکدەچێت.

هەموو کاروبارەکانی ناو ئەم گەردوونە فراوانە بەڕێکوپێکیو بێهەڵە دەڕوات بەڕێوە، نە ئەستێرەکان دەکێشن بەیەکداو نەئەتۆمەکان. بەڕێوەچونی کارەکان بەم شێوە پڕ ڕێکوپێکییە یەکتایی خودامان بۆ ڕووندەکاتەوە.

دەبێت تاکە خودایەك هەموو ئەستێرەکان هەڵسووڕێنێت بۆیە بەیەکدا ناکێشن، دەبێت خاوەنی هەموو ئەتۆمەکان تاکە خودایەك بێت بۆیە ئەو پێنووسەی سەرمێزەکە لەخۆیەوە ناگۆڕێت بەبۆمبێکی ئەتۆمی!

بێگومان زیادەڕۆیی لە وتەکانیدا نییە! ئەگەر بێت و ئەلیکترۆنی ئەو ئەتۆمانەی پێنووسەکەیان پێکهێناوە بچن بەناویەکەدا بڵێیت چی ڕوودەدات؟

بۆچی ئۆتۆمبیلەکان دەکێشن بەیەکداو ڕووداوی دڵتەزێنی لێدەکەوێتەوە؟ چونکە شۆفێری هەر یەك لەوان جیاوازن! هەر شۆفێرێك ئۆتۆمبیلەکەی خۆی بەپێی پێوەرەکانی مێشکی خۆی لێدەخوڕێ، لە شوێنێکداو لە هەمان کاتدا یەکێکیان بیەوێت بێت، گەر دانەیەکی تر بیەوێت بڕوا ئەوکات کارەکە تێکدەچێت! ئەی باشە ئەستێرەکان بۆ ناکێشن بەیەکدا؟

لەبەرئـەوەی هـەمان کاربەدەسـت هـەموویان دەبزوێنێـت. یـەك زانای کارا بڕیـار لەسـەر شـوێنی ڕۆشـتنیان دەدات بۆیـە نابێتـە هۆسەو هەرکەس بۆ خـۆی. هـەروەها ئەسـتێرەکان بەژمارەیـەك کـە لـەهیی دانـەکانی لمـی سـەرزەوی زۆر زیـاترە، لەبۆشـایی ئاسماندا و لە ڕاسەرماندا دێن و دەچن.

وەك چۆن لەوڵاتێکدا دوو سەرۆك،

لە شارێکدا دوو سەرۆکی شارەوانی،

لە گوندێکـدا دوو موختـار نابێـت هـەبێت، هـەرواش سـوڵتانی ئەم گەردوونـە تاکـە کەسـێکە. تاقانـەیی ئـەو لەهـەموو شـتێکدا دیارە.

ئێستا نموونەیەکی دیکەت بۆ دەگێڕمـەوە، بـەڵام دەبێـت بـە چاکی گوێم بۆ ڕاگریت.

## هەموو شتێك یەکتایی خودا دووپات دەکاتەوە

وردبـەرەوە لـە کەرەسـتەکانی ماڵـەوەتان، قەنەفـەکان هیـی کارگەیەکــە، تەلەفزیۆنەکــە هیــی کارگەیــەکی تــر، مێــزی نانخواردنەکــەو کورسـیەکان بەرهــەمی کارگەیــەکی دیکەیــە. هەرچی قاڵیەکانیشە لە جێگایەکی تر کڕیوتانە.

بەڵام ئەو گەردونە ئاوا نییە! بەڵکو لەسەر هەموو کەرەستەکانی ئێرە نیشانەی هەمان کەسی پێوەیە:"خودا منی هێناوەتە بوون".

هەموو شتێك لێرە. میوەکان، درەختەکان، خۆر، باڵندەکان و منداڵە ساواکان...هەر شتێك کە بە مێشکدابێت، پێکەوە بە پەیوەندێکی هێندە بەهێز پێکەوە بەستراون کە هیچ شتێك ناتوانێت لێکیان جودا بکاتەوە، یەك دانەیان هیی کێ بێت، هەموویان هیی ئەون.

یەك دانەیان کێ ئافراندبێتی هەموویان هەر ئەو ئافراندوونی، کەسێکی تر ناتوانێت بانگەواز بکات و بڵێت "من ئەمەیانم بەدی هێناوە".

بۆ تێگەیشتن لەمە نمونەی پەرداخێك شیرت بۆ باس دەکەم:

ئێستا یاریەکی پرسیارو وەڵام سازدەکەین، من دەپرسم و تۆش وەڵام بدەرەوە:

- ئەو پەرداخە شیرەی لەسەر مێزەکەیە چۆن هاتە ئەوێ؟
- دایکم لەناو بەفرگرەکە هێنایو لەوێدا داینا.
- باشە چۆن هاتە نێو بەفرگرەکەوە؟
- من دوێنێ لە مارکێتەکە کڕیم.
- مارکێتەکە شیرەکەی لە کوێ هێنا؟
- هممم، گیانەکەم ئەم شتانە کارگەیان هەیە ئیدی.

– زۆر باش دەڕۆین، باشە ئەی کارگە لە کوێوە دەیهێنێت؟

– جێگایەك هەیە پێی دەڵێن مۆڵی شیر.

– مۆڵی شیر لەکوێوە دەیهێنێت؟

– بێگومان لە مانگاکانەوە وەریدەگرن!

– ئەی مانگاکان؟

– دەی دیارە، بەدرێژایی ڕۆژگار گژوگیا دەخۆن و لە ناو سکیاندا دەیکەن بە شیر.

– گژوگیاکان لە کوێوە هاتن؟

– ئەوانیش لەناو خاکدا جێگیردەبن، لە وەرزی بەهاردا سەوز دەبن..

– کەوایە دەبێت چۆنێتی هاتنی بەهار ڕوونبکرێتەوە!

– بەسوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا وەرزەکان دروست دەبن. بەهاریش یەکێکە لەو وەرزانە. ئاوایە ئیدی....

– زۆرباشە، بائێستا سەرەتاو کۆتایی یاریەکەمان پێکەوە ببەستینەوە.

ئەنجام بەم جۆرەیە:

– بۆ هاتنی پەرداخێك شیر بۆ سەر مێزەکەی تۆ، پێویستە گۆی زەوی بەدەوری خۆردا بسوڕێتەوە!

– بەخودا ڕاست دەڵێیت!

– بەڕای تۆ بۆ بەدیهێنانی پەرداخێك شیر پێویست نییە خۆریش بەدیبهێنرێت؟

– بەڵێ کەسێك نەتوانێت خۆر بەدیبهێنێت ناشتوانێت پەرداخێك شیر دروست بکات.

– ئەمە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە خاوەنی ڕاستەقینەی پەرداخێك شیر، خاوەنی خۆریشە.

هەموو شتێکی ناو ئەم گەردوونە وەکو ئەو پەرداخە شیرە پەیوەستە بەهەموو شتەکانی ترەوە، ئەوەی نەتوانێت یەکێك لەوان دروست بکات بێگومان توانای دروستکردنی هیچیانی نییە! بەڵێ تاکە پەرداخە شیرێك یەکتایی خودامان بەم شێوەیە پێ نیشان دەدات.

ئێستا بیر لە مێشێك بكەرەوە، چاوەكانی بۆ بینین پێویستی بەڕووناكی خۆر هەیە. كەواتە چاوی ئەو مێشەو ڕووناكی خۆر بەشێوەیەكی لەگەڵ یەك گونجاو دروستكراون. لەمەوە بۆمان دەردەكەوێت ئەو كەسەی مێشەكەی هێناوەتەبوون، هەر ئەو خۆریشی لە نەبوونەوە هێناوەتەبوون. بەپێی ئەوەی هەردووكیان بەئەندازەی ١٠٠٪ پێكەوە گونجاون دەبێت كەسێك هەردووكیانی بەدیهێنابێت كەشارەزای تەواوو ڕەهای لەبارەی هەردووكیانەوە هەبێت.

ناكرێت كەسێك مێشەكەی ئافراندبێت و كەسێكی تر خۆر، بەڵكو هەردووكیان بۆ هەمان ئافرێن دەگەڕێنەوە. چیدی پێویست بە وتنی ئەو هاوبەشیانەی لەنێوان هەردوولا هەیە ناكات.

هەروەك لەم نموونەیەدا هاتووە:

هەركەسێك باڵندەكانی هێناوەتەبوون هەرئەویش ئەم هەوایەی هێناوەتە بوون، چونكە ئەم باڵندانە تەنیا لەم جۆرە هەوایەدا دەتوانن بفڕن. خودایەك كە باڵندەكان، باڵەكانیان، تەنانەت دانەدانەی پەڕی باڵەكانیانی دروستكردووە هەر ئەویش بەرگە هەوا(ئەتمۆسفێر)ی لەوێدا ڕاگرتووە.

تۆ ئێستا دەتوانیت بۆ خۆت لەمیوەکان و درەختەکان و جەستەی خۆت نموونە دەربێنیت، بیر لەهەر شتێك بکەیتەوە یەکتایی خودات نیشان دەدات.

لەبەرئەوەی هەموو شتەکانی ئەم گەردوونە وابەستەی یەکترن و ئاماژە بۆ (یەك) دەکەن، وەك پەرداخێك شیر، وەك چاوەکانی مێشێك......

## ئەوەی باوەڕ بەخودایەکی تاقانە نەهێنێت ناچارە خوداگەلی جۆراوجۆر بپەرستێ!

مرۆڤ ئەگەر خاوەنی باوەڕێکی ڕاست و دروست نەبێت بەخودای تاقانە، گەلێك پێکەنیناویە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر جێگای داخەو خەمهێنە.

بۆ نموونە میتۆلۆژی (ئەفسانەزانی)یەکانی یۆنانت بیستووە. لەوێدا بەسەدەها ناوی خواوەندی جۆربەجۆر هەیە. ئیدی وایە مرۆڤ کە باوەڕی بەخودای تاقانە لەدەستدا ناچارە ملکەچی بکات بۆ چەندین خواوەندی درۆینە کە هیچ بنەمایەکیان نییەو مرۆڤ بەخەیاڵی خۆی دەیخولقێنێ.

شتانێك خۆشیان دەوێن، شتانێك لێیان دەترسێن، شتانێك پێویستیان پێیەتی هەریەکەیان خودایەکی تایبەت بەخۆیان ڕادەگەیەنن.

بۆ وێنە خواوەندی ڕەشەبا، خواوەندی ئاگر، خواوەندی دەریا، خواوەندی چیا..هتد.

هیندەکان ئەم بابەتی خواوەندە بەجۆرێکی زۆر سەرسوڕهێن لێکدەدەنەوە. هەتا ئەمڕۆ باوەڕیان بەسەدەها بگرە هەزارەها خواوەندی جیاواز هەیە. یەکێك لە بەناوبانگترینیان مانگایە.

خوای گەورە دەفەرموێت: (( ئەگەر لە ئاسمانەکان و زەویدا بێجگە لە(الله)خودایەکی دیکە هەبووایە، ئەوکات لە هیچ کام لەو دووانەدا ڕێکوپێکی(تەرتیب)نەدەما.)) الأنبياء: ٢٢.

# خودا چۆن دەتوانێت لە هەمان کاتدا ئەو هەمووو کارە ئەنجام بدات؟

زۆربەی ئەو پرسیارانەی دەربارەی خودا لەلامان دروست دەبێت بەهۆی ئەوەوەیە کە بەپێی قەدو قیافەی خۆمان بیر لە خودا دەکەینەوە.

دەپرسیت گوایە "کە من ناتوانم ئەنجامی بدەم خودا چۆن دەتوانێت بەئاسانی ئەنجامی بدات؟".

ڕاستە! تۆ لە هەمان کاتدا توانای ڕوانینت بۆ دوولای جیاواز نییە.

له هەمان کاتدا دوو وشەی جیاوازت بۆ ناوترێت، دوو وشەی گوتراو لەهەمان کاتدا ناتوانیت ببیستیت، گەر بشیببیستیت ناتوانیت لێیان تێبگەیت.

ئەقڵ و جەستەت سنوری دیاریکراوی خۆیان هەیە، یەکێك لەوانەش ئەمەیە:

لەیەك کاتدا دووشتی جیاواز ناتوانیت ئەنجام بدەی تەنانەت بیربکەیتەوە! بەڵام لەوەرزی بەهاردا ملیارەها خونچە لەشەوێکدا دەکرێتەوە. لەسەروبەندی کرانەوەی خونچەکاندا ژمارەیەکی لەڕادەبەدەر بێچوە باڵندە (زەرنەقوتە) لەناو هێلکەکانیەوە دێنەدەرەوە.

لەکاتی گەورەبوونی بێچوەکان لەنێو هێلکەکاندا، ملیارەها تۆوی وەشێنراو بەزەویەکانەوە دەتەقن و چرۆ دەکەن.

هەر لەم کاتەدا دڵۆپەکانی باران لەسکی هەورەکانی ئاسمانەوە لەدایك دەبن. لە کاتی بارینی دڵۆپەکانی باراندا ونانەوەی دەنگی پڕ لە مۆسیقای کاتی باران، هەزارەها کۆرپە لەدایك دەبن.

لەکاتی یەکەمین دەنگدانەوەی نوکە نوکی کۆرپەکان لە گوێچکەی دایکەکانیاندا، لەسەر ڕووی خۆر ژمارەیەکی زۆر تەقینەوە ڕوودەدات.

هـــەزارەها بـــەردی ئاسمـــانی دەکەونـــە ســـەر ڕووی مـــانگ و بـەخۆش کەیفیەکـەوە پەلکـە زێڕینـەی ڕەنگـاوڕەنگی نەقاشـی کراوی نێو ئاسمانی شین نیشانی یەکتری دەدەن.

لەسەروبەندی درەوشانەوەی پەلکەزێڕینەدا، چەندین مەتر لە ژێــر ئاوەکانــدا، ملیارەهــا ماســی گچــکە بــۆ یەکــەمین جــار ڕیشوەکەوانەکانیان دەبزوێنن.

کاتێـک ماسـیەکان بـەخێرایی لـە مەرجانـە ڕەنگاوڕەنگـەکان دووردەکەونەوە، لەهەمان کاتدا باوکێك بۆ یەکـەمین جـار چـاوی دەکەوێت بە دارەدارەی منداڵەکەی.

شێرێك دەنەڕێنێت، کەسێك ترپەی دڵـی دێـت، کەناریـەك بـۆ یەکەم جار دەخوێنێت، فیلێك لە نـاو جەرگـەی دارسـتانێکدا دوا هەناسەی هەڵدەمژێت.

قەلەڕەشێکی پیری سۆعبەتچی هەوڵی شکاندنی تـوێکڵی ئـەو گوێزەی حەشاری دابوو دەدات.

لەشوێنێك ڕۆژ تازە هەڵدێت و لەشـوێنێکی دیکـە ئاوادەبێـت. منداڵێك خەو دەبینێت و یـەکێکی دیکـە بـەدەم خەندەیەکـەوە، دەڵێت "بەیانیت باش دایە گیان"

لەناو جەستەدا ملیارەها خانە دەمرن و ئەوەندەی تر لە دایك دەبن.

خوێن بـەناو مولولەکانـدا دەڕوات، دڵـت لێـدەدات، خانـەکانی مێشکت پەیام بۆ یەکتری دەنێرن.....

ئەستێرەیەك دەکشێت....

لە ئاسمان فریشتەکان زەردەخەنە دەکەن.....

ئەمانـەو ملیارەهـای تـری وەکـو ئـەم کارانـە، بـەبێ ئـەوەی تێکـەڵی یـەکتری بـبن و بەیەکـدا بکێشـن یـاخود تـەرازوویان تێکبچێت، بەفەرمانی خودا جێ بەجێ دەبن و تەواو دەبن.

لە هەمان کاتیشدا...

تۆ دەپرسیت:

"خـودا چۆن دەتوانێت لـە هـەمان کاتـدا ئـەم هـەموو کـارە ئەنجام بدات و بهێنێتەدی؟".

گەر بە وردی چاوێك لە چواردەوری خۆت بکەیت، گەلێك مەخلوقی خودا دەبینیت و چەندین کاریشت چاو پێدەکەوێت کە لە هەمان کاتدا دەکرێت.

ئەو کات باوەڕنەکردنت بەوەی خودا بەهۆی تواناو قودرەتی نەبڕاوەیەوە دەتوانێت ناکۆتا بەدیهێنراوی خۆی بهێنێتە بوون، شیاوی باس نییە.

بۆ وێنە بڕوانە ئەو خۆرەی پەروەردگار؛

بەهەڵهاتنی هەموو کەس و شتێك لەهەمان کاتدا ڕوناك دەبنەوە.

وشە بەوشەی پیاوێکی قسەکەر لەبەردەم دەیەها هەزار کەسدا لەلایەن گوێچکەی ئامادەبووانەوە دەبیسترێت.

هێزی کێش کردنی زەوی لەهەمان کاتدا هەمووشتێك کێش دەکات.

هەموو ئەمانە بەهۆی یاسای بەدهێنراوی خواوەندەوە دەبێت. کەوایە بەدیهێنانی هەموو بوون لەهەمان کاتدا لەلایەن خوداوە بەئەندازەی ڕووناککردنەوەی هەمووشتێکی سەرزەوی لەهەمان کاتدا، بەئەندازەی بیستنی وشەکانی قسەکەرێك

لەلایەن دەیەها هەزار گوێگرەوە، بەئەندازەی کێشکردنی هـەموو شتێك بەهۆی هێزی کێشکردنی زەویەوە، کارێکی ئاسانە.

# خودا فەرمان دەکات"ببە"، دەبێت

خـودای گـەورە دەفـەرموێت: ((ئێمـە هەرشـتێکمان بوێـت، وتەمان بریتیە لە(ببە) و ئەویش دەستبەجێ دەبێت.)) النحل: ٤٠.

خودا چەند بەئاسانی گوڵێك بەدیبهێنێت، هەر بەو ئاسانیەش بەهارێك سازدەکات.

خودا چەند بە ئاسانی ئەتۆمێك (گەردیلەیـەك) هەڵسـوڕێنێت، هەر بەو ئاسانیە هەسارەکانیش هەڵدەسوڕێنێت.

خودا چەند بەئاسانی یـەك مـرۆڤ بـژێنێت، هـەر بـەو ئاسـانیە هەموو مرۆڤایەتی دەژێنێت.

کارە بچوکەکان ئاسـانن، کـارە گـەورەکانیش قورسـن. بـەڵام ئەمە بۆ ئێمە وایە.

بۆ خودا بچوك و گەورە وەك یەکن.

بۆ خودا کەم و زۆر وەك یەکن.

بۆ خودا یەك و هەزار تەوفیرێك ناکات.

بۆ خودا جیاوازیەك لەنێوان قورس و سوکدا نییە.

چونکە خودا دەڵێت ببە! هەرچیەکی بوێت ئەوە دەبێت!

بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە بابەتەکە نموونەیەك باس دەکەین:

تۆ خوێندەواریت هەیەو دەتوانیت بنووسیت، واتە پیتەکان ڕێکبخەیت و وشەو ڕستەیان لێ دروست دەبکەیت.

ئێستا پێم بڵێ، گەر قەڵەمەکەت بگریت بەدەستەوە بنووسیت(یەك)! ئاسانترە یاخود (هەزار)؟

چی، وتت جیاوازی چییە؟

چۆن گیانەکەم؟ چۆن جیاوازی نیە، یەکێکیان(یەك)ە و ئەویدی (هەزارە)ە؟

بەدڵنیایەوە تەوفیرێکی نییە، بۆ کەسێك بزانێت بنووسێت، نووسینی(یەك) و (هەزار) هیچ جیاوازیەك لە نێوانیاندا نییە بێجگە لە پیتێك.

بەو پێیەی نووسینی(یەك) لە (هەزار) ئاسانترنییە، کەواتە نووسینی (هەزار) لە (یەك)یش قورسترنییە.

باشە جیاوازی لە نێوان نووسینی وشەی (بچوك) و (گەورە) دا هەیە؟ ئایا وشەی (بچوك) لەبەرئەوەی بچوکە ئاسانە، یاخود وشەی (گەورە) لەبەرئەوەی گەورەیە قورسە؟ هەردووکیان ئاسانن.

لە ڕوانگەی ئەم نمونە ئاسانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە:

بۆ ئەو خوایەی لە نەبونەوە دەهێنێتە بوون جیاوازیەك لە نێوان بچوك و گەورەدا نییە.

چ گەردیلەیەك و چ هەسارەیەك، چ تاکە گوڵێك چ هەزارەها گوڵ بۆ خودا یەکسانن.

کە خودا فەرمانی کرد (ببە) هەرچیەکی بوێت دەبێت، خودا مەیلی لێ بێت چ یەك دانەو چ هەزار دانە دەهێنێتە بوون.

خودا گەر مەیلی لێبێت گەورە دروست دەکات و بچوکیش.

یەك گوڵ دێنێتە بوون.

درەختێك دێنێتە بوون.

بەهارێك دێنێتە بوون.

بەهەشتێك دێنێتە بوون.

هەموو بۆ خودا یەكە.

گەردیلەیەك دێنێتە بوون.

مێشێك دێنێتە بوون.

چیایەك دێنێتە بوون.

زەویەك دێنێتە بوون.

وەك چۆن ملیارەها مێش دێنێتە بوون، ملیارەها هەسارەش دێنێتە بوون.

هەمووی بۆ خودا یەكسانە.

ئەو فەرمان بدات (ببە) هەر شتێك مەیلی لێبێت لەدایك دەبێت بەبێ یەك و دوو...

## كە فەرمان دەكات (ببە)، چۆن دەبێت؟

ئەگەر تۆ بڵێی (ببە) هیچ شتێك نابێت، ئەگەر من بڵێم (ببە) هیچ شتێك نابێت، ئەگەر هەردووكیشمان پێكەوە بڵێین (ببە) هەر هیچ شتێك نابێت!!

مشتێك خۆڵ بگرین بەدەستمانەوە بڵێین (ببە بەگوڵ)، نابێت. هێلکەیەك بگرین بەدەستمانەوە بڵێین (ببە بە باڵندە)، ناکرێت لەپڕ لە شەقەی باڵ بدات و بفڕێت.

ڕوبکەینە هەورەکانی ئاسمان و بڵێین (باران ببارێنە)، یەك دڵۆپیش نابارێت.

هاوار لە پەلی درەختەکان بکەین (ببە بەمیوە)، نابێت.

ئێمە هەرچەندە دەتوانین با بڵێین (ببە)، بەڵام هیچ شتێك نابێت!

چونکە قسەی ئێمە لای خاك، ئاو، خۆر، هەوا، درەخت ناخوات.

چونکە خاوەنی ئەوان ئێمەنین.

چونکە ئێمە ئەوانمان نەهێناوەتە بوون.

بەڵێ درەختێك گوێ بۆ ئێمە ڕاناگرێت، چونکە ئەو پەلەی لەوێیە ئێمە بەدرەختەکەوە ڕاگیرمان نەکردوە، کاتێك تۆوێك بوو ئێمە نەبووین لەناو ئەو خاکە تاریکەدا کردمان بەو درەختە گەورەیە، هەروەك چۆن چرۆکان و پەلەکانیو ڕەگەکانیو توێکڵەکەی ئێمە دروستمان نەکردوون. درەختەکە بەقسەمان ناکات، پەلەکانیش...

بــه وتنـــی (ببـــه) لەلایـــەن ئادەمییـــەوە، گـــێلاس لەپـــەلی درەختەکاندا کاڵەك لە بێستاندا، هـەنگوین لـە شـانەدا، دروسـت نابێت، هەروەك چۆن هێلکەکان نابنە باڵندەو بفڕن. بەڵام ئەگەر خودا بڵێت (ببە) هەموو شتێك دەبێت.

تـۆ لەبەرئـەوەی سـەربازیت نـەکردووە پـێ نازانیـت، هـەموو سوپایەك فەرماندەیەکی هەیە:

فەرماندە بڵێت (ڕاوەستە)، هەموو سوپا پێکڕا ڕادەوەستێت.

فەرماندە بڵێت (ڕاکە) هەمووی ڕادەکات.

فەرماندە بڵێت (بەدەمدا بکەوە) هەمووی دەکەوێت.

فەرماندە بڵێت (وەرە)هەمووی بەرەو لای دێت.

لەبەرئەوەی ئەو فەرماندەیە، سەرانی سوپا هەمووی گوێ بـۆ ئەو دەگرن و فەرمان بەجێ دێنن. ئەگەر بەهەمان سوپا من بڵێم ڕاکــە کــەس لــە جێــی خــۆی نابزوێــت. گــەر هــاوار بکــەم (وەرە)هەمووی پێدەکەنێت. چونکە مـن فەرمانـدە نـیم و قسـەم نـاڕوات، تـەنیا قسـەی فەرمانـدەی ڕاسـتیی لای ئـەوان حسـابی بۆدەکرێت.

وەرە لەبەر ڕۆشنایی ئەم نموونەیە سەیری گەردوون بکە.

دەبینین تەنیا گوێ بۆ فەرمانی خودا ڕادەگیرێت چونکە سوڵتانی ئەم کۆشکە ئەوە. هەموو شتێك گوێڕایەڵی فەرمانی ئەوەو فەرمانی ئەو جێبەجێ دەکەن.

لەسەر زەوی لە ئاسمانەکان هەرچی هەبێت هی ئەوەو بەروخسەتی ئەو دەجولێنەوە.

ئەو شتانەی بەوتنی ببەی ئێمە ڕوو نادەن بەفەرمانی ئەو دەستبەجێ ڕوودەدەن.

خودا دەفەرموێت (ببە!)، لەسەر پەلی درەختەکان میوە دروست دەبێت.

خودا دەفەرموێت (ببە!)، لە باخچەکاندا گوڵ دەڕوێت.

خودا دەفەرموێت (ببە!)، لە شانەکاندا هەنگوین دروست دەبێت.

خودا دەفەرموێت (ببە!)، لە هەورەکانەوە باران دەبارێت.

بە فەرمانی (ببە)ی خودا کۆرپەلە لە سکی دایکاندا دروست دەبێت.

بەفەرمانی (ببە)ی خودا بەرگی تۆوەکان دەتەقێت.

به فەرمانی (ببە)ی خودا تۆوە تەقیوەکان چەکەرە دەکەن.

به فەرمانی (ببە)ی خودا ئەو چەکەرانە بەردو خۆڵی سەر سەریان دەسمن و سەردێننە دەرەوە.

به فەرمانی (ببە)ی خودا چەکەرە سەر دەرهاتوەکان گەورە دەبن.

گەورەدەبن، گەورەدەبن، گەورەدەبن....

خودا فەرمان دەکات (ببە)، چەکەرەو نەمامەکان دەبنە درەخت.

درەختەکە پەلی لێ دەبێتەوەو، لەسەر پەلەکان میوە دروست دەبێت.

میوەکە تام، بۆن، ڕەنگ و شێوەی خۆی وەردەگرێت.

هەرچیەك بێت مادەم خودا بڵێ (ببە) دێتەبوون.

ئەو خاوەنی هەموو شتێکە و پەروەردگاری ئێمەشە.

خودای گەورە دەفەرموێت: (( بێ شك هەرچیەك لە ئاسمان و زەویدا هەیە هی ئەون، هەموو ملکەچی ئەون، ئەو بەدیهێنەری ئاسمان و زەوی و بە دیهێنەرێکی بێ هاوتایە، کاتێك مەیلی لە شتێك بێت تەنها فەرماندکات (ببە) و دەبێت.)) البقرة: ١١٦-١١٧.

خودای گەورە دەفەرموێت: ((لە ئاسمانەکان و زەویدا هەرکەسێك هەبێت هی ئەوەو هەموویان ملکەچن بۆ ئەو.)) الروم: ٢٦.

هەروەها خودای گەورە دەفەرموێت:

(( باش بزانن، هەرچییەك لەئاسمانەکان و زەویدا هەبێت هیی (الله)یە.)) یونس: ٥٥.

# بۆچی خودا بۆ بەدیهێنانی میوە درەختەکان دەئافرێنێت؟

چ پێویست دەکات، وانیە؟ پاش ئەوەی خودا ئارەزووی بەرهەمهێنانی سێوی کرد چ پێویست بەدرەختی سێو دەکات؟
خۆ سێویش دەتوانرا وەکو باران لە هەورەکانەوە داببارێتە خوارەوە، یاخود وەکو شەونم لەپڕدا دروست ببێت.
بۆچی خودا بۆ بەرهەمهێنانی سێوێك درەختێك دەئافرێنێت؟
ئایا خودا مەجبورە بۆ بەرهەمهێنانی سێو درەختی سێو دروست بکات؟

بڕوانە ئەمجارە ئیدی بەڕاستی پرسیارێکی توندت ئاڕاستە کردم بەڵام دڵ لەدڵ نەدەی منیش وەڵامی توندم پێیە.

وەك لای تۆش ئاشکرایە پەروەردگار بۆ بەرهەمهێنانی شیر نیازی بەمەڕو بۆ بەرهەمهێنانی هەنگوین نیازێکی بەمێش هەنگ نییە. هەرواش بۆ بەرهەمهێنانی سێو نیازی بەدرەختی سێو نییە.

ئەگەر خودا مەیلی لێبوایە سێوی بەبێ درەخت، شیری بەبێ مەڕو هەنگوینیشی بەبێ مێش هەنگ بەرهەم دەهێنا.

دەکرا بەیانیان شوشە شیر بەئامادەکراوی لەبەردەم دەرگای ماڵەوەدا ببینینەوە بەبێ ئەوەی بزانیت لەکوێوە هاتووە!

وە ئەگەر خودا بیویستایە دەکرا بارانی هەنگوین لە ئاسمانەوە بەسەتڵ ببارێت ...

بەڵام خودا واناکات. بەڵکو هەرچیەك بەدیبهێنێت لەڕێگەی کۆمەڵە هۆکارێکەوە پێشکەشی ئێمەی دەکات.

سێو بەدەستی درەخت، شیر بەدەستی ئاژەڵان و هونگوینیش لەڕێگەی هۆکاری مێش هەنگەوە پێشکەشی مرۆڤەکانی دەکات.

باشە ئەمە بۆچی ؟

بۆچی خودا بەو شێوازە نایهێنێتە بوون؟

## هەموو شتێك هۆكارێكی هەیە !

بێشك بەدیهێنانی هەموو شتێك بەهۆی كۆمەڵە هۆكارێكەوە لەم دونیایەدا لەلایەن خوای بەدیهێنەرەوە، هۆكارێكی تایبەتی خۆی هەیە.

ئێمە لەم دونیایەدا بۆ ناسینی خودا، دەڕوانینە ئەو سنعەتانەی ئەو بەدیهێناون، لەو ڕوانگەیەوە تێدەگەین بەدیهێنەرمان چۆن خودایەكە.

ئەگەر خودا بەبێ بوونی هۆكارو بەڕاستەوخۆیی شتەكانی لە نەبوونەوە بهێنایەتە بوون، ئەوكات ئێمە بەم ڕاددەیەی ئێستا لەگەورەیی زاتی ئەو تێنەدەگەیشتین.

بۆ وێنە گەر بەدیهێنانی سێو بەبێ بوونی درەختی سێو بووایە، ئەوا نەماندەزانی بەرهەمهاتنی ئەو شەكرەسێوە لەپەلوپۆی ڕەگی درەختەكەوە بەچ ڕێگایەك دەبێت.

مرۆڤ هەرچەند هەوڵبدات لە دارو تەختە مێزو كورسیو شتگەلی سادەی بۆ دروست دەكرێت، بەڵام بڕوانە! پەروەردگار لەهەمان دارو تەختەوە (گێلاس و هە رمێ و شلیك و........هتد) دێنێتە دەرەوە.

نـازانم تـاكو ئێستا تاقیت كردۆتـەوە یـان نـا، ڕۆژێك تـاقی بكەرەوە، گازێك بگرە لەپەلی درەختێكی گێلاس و تـامی بكـە ! بەس وریابە قوتی نەدەیت، نەك تەنیا تامێك ناكەیت وەكو تـامی گێلاس، بەڵكو تامێكی تاڵ لەدەمتدا هەست پێ دەكـەیت، بـەڵێ ئەو پەلوپۆ تاڵە ڕەقـە گێلاس گـەلێكی ناسكی بـەتامی لێدێتـە دەرەوە.

ئەگەر پەروەردگار لەو درەختە تاڵە میوەی شیرینی هەنگوین ئاسای نەهێنایەتـە دەرەوە ئـەم مـوعجیزە گەورەیـەی ئـەومان نـەدەبینیو لەگـەورەیی هونـەری دەسـتی پـەروەردگارمان نەدەگەیشتین.

هەروەها هەلی ستایش کردن و وتنی (ئەی بەدیهێنەری مەزنم تۆ هێندە میهرەبانی لەداری ڕەق و تەق میوەی ناسک و بەلەزەت بۆ ئێمە بەرهەم دێنێت)مان نەدەبوو.

بیرێک لە شیری ئاژەڵان بکەرەوە، ئەو شیرە پاک و بێگەردەی لە زگی مانگاو مەڕو بزنەوە لەنێوان خوێن و ئەو گیایەی دوای هەرس کردن دەبێتە پاشەڕۆو دەردێتەدەرەوە، لەنێوان ئاوو کای وشکەوە هەڵدەقوڵێت...

ئەگەر خودا لەڕێگای ئاژەڵانەوە شیری دروست نەکردایە، ئەم پرۆسە دەرئاساییەمان چاو پێنەدەکەوت، ئێستا پێت وانییە بەرهەمهێنانی شیر بەم شێوەیە موعجیزەیەکی گەورەیە؟

خـەمت نـەبێ پێـت نـاڵێم (بڕێـك كـا بهێنـە، هەنـدێك گیـا كۆكەرەوە، لەگەڵ ئاودا تێكەڵیان بكە بزانە تامی چۆنە؟)

ئەی دەربارەی هەنگوین چی دەڵێیت؟ خودا مـێش هـەنگێكی هـەڵگری چـوزێكی ژەهرینـی كـردووە بـەهۆكاری دروسـتكردنی هەنگوینێكی شیرینی بێ وێنە كە شیفایە بۆ چەندین نەخۆشی.

ئەگـەر زانیاریـت دەربـارەی هـەنگوین نەبوایـە، هـەرگیز پێشبینی ئەوەت دەكرد ئەم بەخششە شیرینە لە زینـدەوەرێكی ژەهـراوی وەكـو مـێش هەنگـەوە دروسـت ببێـت؟ بێگومانبـە پێشبینیت نەدەكرد.

هەروەك چۆن پێشبینیت نەدەكرد، گێلاس لـە درەختـی ڕەق و تەق بڕوێت.

شیری سپی بەفرین لە گوانی مانگـاوە هـەڵبقوڵێت، هـەرواش پێش بینیت نەدەكرد هەنگوین بـەهۆی مـێش هەنگـەوە بەرهـەم بێت.

ئێستا با بێینە لای باڵنـدەكان، خـودا دەیتـوانی ئـەم باڵنـدە جـوان و قەشـەنگانە لـە ئاسمانـدا رابگرێـت، بەڕاسـتەوخۆیی و لەنەبوونەوە بهێنێتە بوون، بەڵام ئەوكات كەس هاتنـە دەرەوەی

بێچـووه چـۆلەکەیەکی جـوانی لـەنێو هێلکەیـەکی بێگیانــەوه نەدەبینی، ئەوکات نەمانـدەبینی بەفـەرمانی خـودا چۆن هێلکە هەمــەجۆرەکان دەگۆڕێــت بـۆ پەڕەسـێلکەی کلـك بریقــەدار، چـۆلەکەی خنجیلانـە، کـۆتری چـاوتیژی جوانکیلـە، نەوڕەسـی سـپیو سـۆڵ، تاوسـی پـەڕو پـۆ ڕەنگـین و مریشــکی کارگـەی هێلکەی پڕ لەپڕۆتینو خواردنی بەیانیان.

بیرێك لەهەموو خواردنەکان بکەرەوه، چاوێك بخشێنە بەگوڵە گەنمەکان، پەتاتەکان، فاسۆلیا، ترێـی نـاو ڕەزەکـان، کالـەك و شوتی ناو بێستانەکان، خودا بۆ بەرهــەم هێنـانی هـەموو ئەوانـە خاك و ئاوو هەوای کردووه بەهۆکار.

خاك و ئاوو هەوایـەك کـە خۆیـان ناناسـن، ئێمـەش ناناسـن و نازانن پێداویستییەکانی گەدەی ئێمـە چـین، کراونەتـە هۆکـاری بەرهەمهاتنی هەموو ئەو خۆراکانە.

ئێستا با ئێمە بێین بڕوانینـە دانـە دانـەی خـاك و ئـاوو هـەوا، پاشـانیش جـارێکی تـرو جـارێکی تـرو بگـرە هـەزاران جـاری تـر بکۆڵینەوه لەسـەوزەو میوەکـان، هەوڵبـدەین بـزانین (الله) چـۆن بەدیهێنەرێکە. ئەگەر هاتنـەبوونی ئـەو موعجیزانـەمان نەبینیایـە لەو هۆکارە ساکارانەوه هێنـدەی ئێسـتا بەچـاکی پـەروەردگاری خۆمان نەدەناسیو بەسیفەتی بێوێنەی ئەو ئاشنا نەدەبووین.

## باشتر كه هۆكارەكان هەن

ئێستا گومان لەوەدا نییە پرسیارێكی ئاوا بەمێشكتدا دێت: ئەگەر هۆكارەكان نەبوونایە، بەپێچەوانەوە سێوو هەموو خواردنەكانی دیكە لەپڕ بهاتنایەتە بوون موعجیزەكە گەورەتر نەدەبوو؟

نەخێر!

سەرەتا هاتنەبوونی سێوێك لەپڕو هەر لە خۆوە تۆی سەرسام دەكرد، لەتاوا چاوەكانت بەئەندازەی تایەی ئۆتۆمبیل دەكرانەوە.

بۆ دووەم جار هەمان ڕووداوت دەبینیو سەرت سوڕدەما، بەڵام كەمتر لە یەكەم جار.

بۆ جاری سێیەم زۆر كەمتر توشی واق وڕمان دەبویت.

بۆ جاری چوارەم كەمترو كەمتر.......

بۆ جاری سەدهەمین هاتنەبوونی سێوێك بەهیچ جۆرێك گرنگی نەدەبوو لەلات، ئەوكاتە دەتگوت (ئەم شتانە وەها دەبن ئیدی، چۆن دەبێت، دەبێت ئیدی) نەتدەزانی خودا بەچ شێوەیەك سێو دێنێتە بوون هەر لەبەرئەوەش تامەزرۆی فێربوون و ناسینی ئەوت نەدەكرد.

لەبەرئەوە هەموو وەرزێکی بەهار، ژیانەوەی درەختە وشك بووەکان و سەوزبوونەوەو گوڵکردن و پەیدابوونی سێوە لاسوورەی تام شیرین و گەورە لەسەر پەلەکانیان، بینینی هەموو ئەمانەو هەنگاو بەهەنگاو شوێن کەوتنیان وەڵامێکی تێرو تەسەلەو دووبارەبووەوەی پرسیاری "خودا چۆن سێو دروست دەکات؟"ە.

باشتر کە هۆکارەکان هەن .

لە ڕاستیدا هۆکارەکان هەر لەبەرئەمە هەن، بۆ ئەوەی مرۆڤ ببینێت و هەنگاو بەهەنگاو لە هونەری یەزدانی مەزنی ورد ببێتەوە. چونکە هەموو ئەو کردارە جوانانە، پەیدابوونی میوە لە درەختی ڕەق و وشکەوە، هەڵقوڵانی شیر لەگوانی

مانگاکانەوە، دروستبوونی هەنگوین لە مێش هەنگە گچکەکانەوە، هەواڵدەری هونەری پەروەردگارن، باشترین ناسێنەری زاتی ئەون.

## پەیامبەرانی پادشا

ئاشکرایە لات، کاتێک پادشا دەیەوێت دیاری بۆ کەسێک بنێرێت دەیداتە دەستی خزماتکارەکەیو بەودا بۆی دەنێرێت. چونکە لەگەڵ شان و شەوکەتی پاشادا ناگونجێت خودی خۆی دیارییەکەی بۆ بهێنێت.

دەڵێن سەردەمانی کۆن پیاوێک هەبوو زۆر هەژارو بێدەرەتان بوو. ڕۆژێک لەدەرگای ماڵەکەی درا. کابرا دەرگاکەی کردەوە، کێ ببینێت! نەناسێک پڕ دەستی بوو لە دیاری جۆراوجۆرو بەنرخ، ئەو پیاوێکی چوارشانەی جوانخاس بوو!

پیاوە هەژارەکە واقی وڕما بوو، وتی:

– قوربان، ئێوە کێن؟

نەناسەکە:

– من نێردراوی پادشام. بە فەرمانی جەنابیان ئەم دیاریانەم لە خەزێنەوە بۆ تۆ هێناوە، ئەمانە وەربگرەو پێداویستی خۆتی پێ دەبرکە.

کابرای هەژار ئەوەندە خۆشحاڵ بوو بەڕووداوەکە، خۆی هاویشتە بەرپێی پیاوەکە باوەشی پێداکردو دەستی کرد بە ماچکردنی دەست و شان و قاچی. سوپاسی کرد، مەمنون بوو، بە چەندین وشەی بریقەدار بەکابرادا هەڵیدا.

نێردراوەکە:

– بەڕێز! تۆ دەزانی چ کارێ دەکەیت! من تەنها نێردراوێکم، ئەو کەسەی دەبێت سوپاسی بکەیت پادشای گەورەمانە! سوپاس گوزاری پادشا بە، بەئەودا هەڵبە، یادی خەزێنەکانی ئەو بکە، باسی بەخشندەیی ئەو بکە. ڕێزی لێ بگرەو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بکە. ئەم دیاریە بەنرخانەش تەنها ئەو دەتوانێت پێتی ببەخشێ.

پیاوە هەژارەکە کەسێکی ژیر بوو، بەبیستنی ئەمانە بێداربووەوە، هەستایە سەرپێ‌و وتی:

– ئافەرین بۆ تۆ! بەڕاستی نێردراو ئاوا دەبێت. من لە خۆشیاندا ئاگام لەخۆم نەما. تۆ منت ورپاکردەوە. گەر وا نەبووایە بە تەماشاکردنێکی سادەی دیاریەکان بۆم دەردەکەوت هیی تۆنین. نێردراوێکی وەکو بەڕێزت بێگومان خاوەنی خەزێنەیەکی لەو جۆرە نییە. ئەمانە هیی خەزێنەی پادشان.

بێگومان من ڕێز لە تۆش دەگرم و سوپاست دەکەم، وەلێ کەسی سەرەکی سوپاسکراو پادشایە، لەمەودوا هەردەم یادی

خەزێنەکانی ئەو دەکەم وە سوپاسگوزاری و پیاهەڵدانەکانم هەر بۆ ئەو دەبێت.

شـەوو ڕۆژ یـادو زیکـری ئـەو دەکـەم و پێداویسـتییەکانم لـەو دەخـوازم. لەمـەودوا هـەر بەخشیشـێکی تـرم بـۆ بێنیـت بـەهیی پادشای گەورەمانی دەزانم.

چونکە ئەم وڵاتە هـەمووی، ئـەم چیایانەو ئاسمـان و زەویو ئەوەی لە نێوانیاندایە هیی ئەو سوڵتانە بەخشندەیەیە.

پاشان هەمان نێردراو کۆمەڵێك دیاری بەنرخی تری لەخەزێنە وەرگـرت و بەهـەمان شـێوەی هـەژاری پێشـوو دای لـە دەرگـای چەندین هەژاری دیکەو دیاریەکانی پێدان.

یەکێ لە هەژارەکان وەکو هەژارەکـەی پێشـوو زۆر سوپاسـی نێردراوەکەی کردو بەوشەی جوان ستایشی کرد.

نێردراوەکـەش بەهـەمان شـێوەی پیـاوی یەکـەم ئەمیشـی بێدارکردەوە. پێـی ڕاگەیانـد ئەوانـە دیـاری خـودی خـۆی نـین، بـەڵکو بەفـەرمانی پادشـا لـە خەزێنـە بـۆی هێنـاوە. وەلێ ئـەم هەژارەیان وەکـو ئـەوی دی کەسـێکی ژیـرو تێگەیشـتوو نـەبوو. وریا نەبووەوە، وتی:

-تۆ باسی کام پادشا دەکەیت. من دەرگاکەم کردەوەو چاوم بە تۆ کەوت. ئەگەر ئەو پادشایەی باسـی لێـوە دەکـەیت بـوونی هەبوایە خۆی دەهات و دیاریەکەی بۆ دەهێنام.

من ئەم شتە بەنرخانە لە دەستی تۆی دەناسم. لە تۆ زیاتر کەسێکی دیکە ناناسم و سوپاسی کەسی دیکەش ناکەم. من ئەگەر بڕوام بەوە نەبێت کە بەچاو دەیبینم، ئەی بڕوا بەچی بهێنم. پادشاو ماشا نییە!

چیرۆکەکە کۆتایی هات. ئێستا بابزانین ئەو وانانەی لەم چیرۆکەوە فێربووین چین!

ئەو درەختانەی لەڕێگەی پەلەکانینەوە میوەی هەمە چەشنمان پێدەدەن هەر وەك ئەو نێردراوەن کەباسمانکرد. خودای کردگار لە خەزێنەی بێ کۆتایی خۆیەوە بەخششی خۆیمان بەدەستی ئەواندا بۆ دەنێرێت. مرۆڤەکانیش بەشێکیان وەکو هەژاری یەکەمن و بەخشەری ڕاستی دیارییەکان دەناسن و سوپاسگوزاری خۆیان پێشکەشی ئەو دەکەن.

بەشەکەی تریش دەڵێن: (( من پادشایەك نابینم! من تەنیا درەختەکان دەبینم بەچاو. ئەوە درەختەکانن میوە بەرهەم دێنن. ئەمە ڕوداوێکی سروشتییە)).

هەروەکو پیاوی ناو چیرۆکەکە نێردراوەکان دەناسێت و بڕوای تەنیا بەوان هەیە، خاوەنی ڕاستەقینەی ئەوان و بەخشەری نیعمەتەکان ناناسێت و بڕوای پێی نییە. لەگەڵ ئەوەی خودای ئێمە کە خاوەنی گەردوونەو گەورەو سوڵتانی

جیهانیانە، نیعمەتە هەمەجۆرەکانی خۆیی لەڕێگەی هۆکاری جیاواز جیاوازەوە دەنێرێت بۆ ئێمە.

یەك لە هۆکارەکان درەختەکانە، بەوێنەی نێردراوی چیرۆکەکە کە وتی: "سوپاسی پادشا بکە، بە پادشادا هەڵبدە. یادی خەزێنەکانی ئەو بکە، باسی بەخشندەیی ئەو بکە. ڕێزی بگرەو گوێڕایەڵی بکە! هەر ئەو دەتوانێت لەم دیاریانەت بۆ بنێرێت" دەیانەوێت پێمان بڵێن: من تەنیا پەلی درەختێکم، دارێکی ئاسایی. ڕەگەکانم چەقیوەتە ناو خاکی تاریکەوە، بێجگە لە ئاوێکی قوڕاوی خۆراکێکی دیکەم نییە!

نەزیریم هەیە نەتوانا. ئێوەش ناناسم ئیدی چۆن بزانم حەزتان لە چییە یاخود گەدەو زمانتان چی پێ خۆشە.

نازانم میوەکانم چی سودێکتان پێدەبەخشێت.

تام چییە، بۆن چییە، ڕەنگ چییە، شێوە چییە، توێکڵ چییە، ناوك چییە، کرۆك چییە، ڤیتامین چییە هیچیان نازانم.

دروستکردنی ئەمانە لەلایەن منەوە کارێکی مەحاڵە، من تەنیا کراوم بەهۆکارێك.

ئیتر تەنها ئاگاتان لەمن بێت و بمپارێزن، باش ڕەفتارم لەگەڵ بکەن بەسە. بەلام پێویست نییە بێن و سوپاسی من

بکەن! میوەکان وەك گێلاس، هەنار، سێو، .... ، شتانێك نین من لە توانامدا بێت دروستیان بکەم.

ئەوانە هەموویان کۆمەڵێك دیاری پەروەردگارەکەتانن کە بەدەستی من پێتان دەدات. سوپاس و ستایشی ئەو بکەن، بەخشندەیی بێ پایانی ئەو بەبیرتان بهێننەوەو یادی ئەو بکەن. هەرگیز خوداکەتان لەبیرنەکەن کە بەم جۆرە میوەی بەلەزەتتان پێدەبەخشێت.

وەکو کۆلارە کە گەلێك جار بەپەلەکانمەوە دەگیرسێتەوەو خۆی هەڵدەواسێت، ئێوەش خۆتان بەمندا هەڵمەواسن....

خودای گەورە دەفەرموێت: ((ئێمە بەهۆی ئەو ئاوەوە چەندەها باخ و باخاتی خورماو ڕەزمان بەدیهێناوە بۆتان (لەو باخ و باخچانەدا) چەندەها میوەهاتی جۆراو جۆری زۆرمان بۆ بەدیهێناون، لە هەندێکیان دەخۆن.)) المؤمنون: ١٩.

هەروەها خودای گەورە دەفەرموێت: ((دەبا ئادەمیزاد سەیری خواردنەکەی بکات و سەرنجی بدات و بیری لێ بکاتەوە. بێگومان ئێمە ئاومان بۆ داباراندووەتە خوارەوە ئەویش چۆن دابارینێك. لەوەودوا زەویمان بۆ لەت لەت کرد بەچەکەرەی ناسکی ڕووەك. ئینجا دانەوێڵەمان تێدا ڕواند. هەروەها ترێ و

سەوزە، هـەروەها زەیتـون و دار خورمـایش. باخچـەی دەوردراو بەدارخورما یاخود باخی چڕوپڕ. جۆرەهـا میـوە هـاوڕێ لەگـەڵ ئـــەو گژوگیایانـــەی کـــە خـــواکردەو مـــاڵات دەیخـــوات لـــە لەوەڕگاکاندا.)) عبس: ٢٤-٣٢

# ئەگەر خودا بەدیهێنەرە،
# ئەی سروشت چ کارەیە؟

لەم پەرتووکەدا وشەی سروشتم بۆ یەکەم جار لە کۆتایی بەشەکەی پێشوودا بەکارهێنا. لەگەڵ ئەوەشدا وشەیەکی تارادەیەك بەربڵاوە لەسەر زاری زۆر کەس.

بۆ وێنە لەناو فیلمە بەڵگەنامەییەکاندا دەڵێن:

"یەکێك لە کردارە سەرسوڕهێنەرەکانی دایکە سروشت، تەکنیکی فڕینی باڵندەکانە لە ئاسماندا".

دایکە سروشت باڵ گەلێکی وەهای بەباڵندەکان داوە، هەر مەپرسن!

ئایا تەنها باڵەکانە؟ دایکە سروشت پەڕێکی هێندە دەرئاسای نوساندوە بەباڵەکانەوە کە ئەقڵ تێپەڕی ناکات....

تەنها پەڕەکان؟ "دایکە سرووووشت..."

بۆ نموونە لەڕێکلامەکاندا:

" ئەم زەیتی زەیتونەی باسمان کرد موعجیزەی سروشتە،

هەتا دەتوانن بخۆن!

ئەم موعجیزەیەی سروشت زۆر باشە بۆتان

بەتایبەت ئەم بەرهەمەی ئێمە وەك هی کارگەکانی تر نییە،

هەرزان و چەشنی باشە

ئەوەی لەسەر ئێمەبوو وتمان...

زەیتی زەیتون موعجیزەی سروشت!"

بۆ نموونە لەوانەی زانستەکاندا:

زۆرباشە منداڵەکان، ئەمڕۆ باسی یەکێك لە ڕووداوە سروشتییەکان دەکەین ئەویش بارینی بارانە.

دەڵێ بەرلەوە ڕووداوێکی سروشتی دیکە هەیە، هەورە بروسکە....

ئاشکرایە! یەکەم جار هەورە بروسکەیە پاشان باران.

مرۆڤ سەری سوڕدەمێنێت لە کاری سروشت!

بۆ نموونە لە زۆرێك لە گۆڤارە زانستیو مێژوویيو جوگرافیاو داهێنانەکاندا:

یــــەکێك لــــە سەرســـــوڕهێنەکانی سروشـــــت، جاڵجاڵۆکــــە هەڵبەزیوەکانــــە. لــــە ژمـــارەی ئـــەم جارەمانــــدا یــــەکێك لەهەرەگرنگترین نهێنییەکانی سروشتتان بۆ دەخەینە ڕوو!

کاتێك بابەتەکەتان خوێندەوە، سەیری ڕەسمەکانیش بکەن! بـۆ ئـەوەی بەچـاوی خۆتـان کـاری سەرسـوڕهێنەری سروشـت ببینین ئەوانەمان لەوێدا داناوە.

مێرووەکان، کەنغـەرەکان، ... هـەموو بـەدیهاتووانی دەسـتی سروشت ئیدی، چی هەیە لە دەگمەنەکان، لە دڵڕفێنەکان...باش بخوێننەوەو فێری نهێنیەکانی سروشت ببن!

بۆ وێنـە لەوتـەی پرۆفیسـۆرەکاندا کـەزووزوو لـە هەواڵەکانـدا دەردەکەون:

"بەگوێرەی ئەو یاسـا سروشـتیانەی کـە هـەن ئـەم ڕوداوانـە، کاتێك دێن بەدواداچوونی قۆناغەکانی پەرەسەندنی بـۆ دەکـەین ڕوبەڕوی ..."

بۆ وێنە لە بەشی هەواڵی گۆڤارەکاندا:

سەرکردەی گەورەو بەڕێزمان لەوتە بەپێزەکەیدا وتی:

با قەدری ئەو نیعمەتە زۆرو هەمـە چەشـنانەی سروشـت پێـی بەخشیوین بزانین!

پێویسته سروشت بپارێزین.

سروشتمان خۆشبوێت، سوپاسی سروشت بکەین، عەشقی سروشت بمانسوتێنێت.

سەیرکەن دایکە سروشت چەند ئێمەی خۆشدەوێت! دایکە سروشت گیان! تۆ منت هێناوەتە بوون!

ئای خوایە! دەبێت ئەم سروشتە چی بێت!

هەر بەڕاست سروشت چییە؟!

پێی دەڵێن دایك، دەبێت زۆر پیربێت. پێتان وانییە ناوی بنێین داپیرە باشتر بێت؟ ڕات چییە بەرامبەر "داپیرە سروشت؟" زانیاریەکت هەیە، سروشت چییە؟

## سروشت چییە؟

هەموو کەسێك دەزانێت، کە وترا سروشت گەلێك شتی زۆر بەبیرماندا دێت، ئەوەندە زۆرن گەر هەموویان بژمێرین لە هەزاران پەرتووکی وەك ئەمەدا جێگایان نابێتەوە.

ئاسمان، دەریاکان، دارستانەکان، تۆێکڵی زەوی، دۆڵەکان، گردەکان،چیاکان، باخ و باخاتەکان...

باڵندەکان، مێرووەکان، ئەسپەکان، فیلەکان، بۆقەکان، ماسییەکان...

درەختــەکان، پەلــەکان، میوەکــان، تۆوەکــان، گوڵــەکان، نەمامەکان...

هــەورە بروســکەو چــەخماخەکان، هــەورەکان، بــاران و بەفرەکان...

خاك، لم، بەردەکان، تاشەبەردەکان...

سروشت هەموو ئەو چوارچێوەیە دەگرێتەوە دەورەی ئێمــەی داوە.

وەلێ لــەو نموونانــەی برێــك پــێش ئێســتا باســمــان کــردن، بەجۆرێك باس لە سروشت دەکەن کە دەبێت زیندوویەك بێـت لـە دەرەوەی هەموو ئەمانەوە.

"موعجیزەی سرووشت"

"دایکە سرووشت"

"یاسا سروشتیەکان"

"سرووشت کردی "

"هونەری سروشت"

"کاریگەری سروشت"

ئەم دەستەواژانە دەڵێیت باسی کەسێك دەکەن، دەڵێیت کەسێك هەیە بەناوی سروشتەوە، یان دایکە سروشت، یاخود هەر ناوێکی دیکە، دەتوانێت کارگەلی سەرسوڕهێنەر ئەنجام بدات و یاسا دەربکات.

لە شوێنێك هەڵەیەك هەیە، با بزانین لە کوێدایە؟

...

گەر لێت بپرسم کێ ئەو نیگارەی کێشاوە؟ پێم دەڵێیت (فلان نیگارکێش). ئەو نووسراوە کێ نووسییویەتی؟ بێ گومان ناڵێیت (نووسراوەکە خۆی لە خۆیەوە نووسرا)، بەپێچەوانەوە دەڵێیت (ئەو نووسەرەی لەوێ دانیشتوە نووسراوەکەی نووسیوە).

بەڵام هەرگیز ناتوانیت بڵێیت:

(هیچ کەسێك ڕەسمەکەی دروست نەکردووەو نووسینەکەش خۆی لە خۆیەوە نووسرا)، چونکە ناکرێت وێنەیەك بەبێ وێنەکێش بێت یاخود نووسراوێك نووسەری نەبێت ...

دەزانم لەقسەکانم تێگەشتیت، وەلێ لەبەر گرنگی بابەتەکە نموونەیەکت بۆ دێنمەوە.

با لێرەدا بنووسین (باڵندە)، وێنەی باڵندەیەکیش دروست بکەین. دواتر پرسیارەکەمان دەکەین.

کێ ئەمەی نووسی؟ کێ ئەم وێنەیەی کێشا؟

وەڵام: نووسەر نووسی، وێنەکێش وێنەکەی کێشا.

ئەی باشە، ئەو چۆلەکە بچوکەی هاتە لای پەنجەرەکە تۆزێك بەر لەئێستا کاری کێیە؟

ئەگەر بڵێین هەردەبێت نووسراوەکە نووسەرێك و نیگارەکەش نیگارکێشێکی هەبێت، ئەوا چۆن دەکرێت ئەو چۆلەکە دڵگیرەی دەرەوە خۆی لەخۆیەوە دروست بووبێت و خۆی لەخۆیەوە بفڕێت؟

دەبێت ئەویش شوێن دەستی کەسێك بێت.

تۆ پەلەمەکە لە وەڵامدانەوە!

وەرە یارییەکی سیخوڕانە بکەین.

لەدەرەوە باڵندەیەك هەیە. بە دوای خاوەنی ئەو باڵندەیەدا دەگەڕێین. لەپێشدا وەك هەموو لێكۆڵەرەوەیەك هەموو بۆچونەكان ڕیزدەكەین:

١- خۆی لەخۆیەوە دروست بوو.

٢- بە ڕێكەوت دروست بوو.

٣- دایكە سروشت بەدیهێنا.

٤- یەكێكە لەو زیندەوەرانەی خودا هێناونیەتە بوون.

بۆچونی دیكەت هەیە؟ وابزانم بێجگە لەو چوار بۆچونە شتێكی تر لەئارادا نییە.

كەوایە یەك یەك لێكیان دەدەینەوە، بەدوی ڕاستەكەیاندا دەگەڕێین.

## ١- خۆی لە خۆیەوە دروست بوو

خێرا ئەم بۆچونە تێدەپەڕێنین! تۆ تاكو ئێستا شتێكت بینیوە خۆی لەخۆیەوە دروست بووبێت؟ هەرگیز بینیوتە تاكە پیتێك لەخۆیەوە لە دەفتەرەكەتدا بنووسرێت؟

## ٢- بە ڕێكەوت دروست بوو

ئەم بۆچونەش كەم تازۆر یەكسانە لەگەڵ ئەوەی پێشوو. (بەڕێكەوت دروست بوو) واتە لەكاتێكدا قوتوی بۆیەكان،

فلّچەکان، پەڕەی وێنەکێشان هەموو پێکەوە بەئارامی لەسەر مێزێکن. (قەیناکات، نایشپرسم کێ ئەوانەی لەوێ دانا!) بایەك هەڵی کرد.

یەکەمجار فلّچەکان کاریان تێکرا بەبایەکە. فلّچەکانیش بەڕێکەت خۆیان لەتەنیشت بۆیەکانەوە بینییەوە. بایەکە بەردەوام بوو لە هەڵکردن. سەرقاپی قوتوی بۆیەکان بەڕێکەوت بەقورسی کرانەوە. ئەم کارە نزیکەی ٥ملیۆن ساڵی خایاند.

لە شەشەمین ملیۆن ساڵدا بەڕێکەوت فلّچەکان تێکەڵی بۆیەکان بوون. ئەمەش چەند ملیۆن ساڵێکی خایاند.

بەڕێکەوت فلّچەکان بەهەموو ڕەنگە جیاوازەکان ڕەنگ کران، لە حەوتەمین ملیۆن ساڵدا، هەر بەڕێکەوت! کەوتنە سەر پەڕەسپییەکە. بەڵێ پاش ئەم ساتە نزیکەی نیوملیۆن ساڵ تێپەڕی. بەڕێکەوت فلّچەکە وێنەی باڵندەیەکی دروستکرد، ئەمەیە بەڕێکەوت! سەیری ئەم ڕێکەوتە بکەن: وێنەی تاوسێکە!

حەزناکەم زیاتر درێژەی پێ بدەم، وەلێ ناوەڕۆکی (بیردۆزی پەرەسەندن) تەواو ئەمە دەگرێتەوە. بەپێی قسەی لایەنگرانی بیردۆزی پەرەسەندن هەموو زیندەوەران بەڕێکەوتێك - هەر دانەیەکیان چەند ملیۆن ساڵێکی دەوێت - هاتونەتە بوون!

باوەڕهێنـــانی ئەســـتەمە وەلێ چـــەندین کـــەس باوەڕهێنـــان بەبیردۆزەکە بەسەر باوەڕهێنان بەخودای تاقانەدا هەڵدەبژێرن.

شت گەلێك کەئەوان پێیـان وایـە بەڕێکـەوت هاتۆتـەبوون زۆر جیاوازە لەوێنەی تاوسەکە. بەڕەنگە هەزارجۆرەکەیەوە. تاوسی ڕاستەقینە، باڵندە ڕەوکەرەکان و چەندین تەکنیکی دەرئاسایی فڕینیـان، پەڕەسـێلکەکان، هــەڵۆ بــەرزەفڕەکان... و هــەموو زیندەوەرەکانی تر کە سەر زەویان هێناوەتە خرۆش....

بیرمـان نەچـێت بـەڕای ئـەوان ئێمـەی مـرۆڤیش بەڕێکـەوت دروستبووین! ملیارەها ساڵ بەر لە ئێسـتاو بەتێپـەڕبوونی کـات لەناو ئاوێکی کۆبووەوەدا ئەمیبیایەك بـەردەوام زۆربـوو و کـەرت بوو (یان هەر شتێکی تری وەك ئەمیبیا) دەرئەنجام مرۆڤێکـی لێ دروست بوو. بەمەڕازیت؟!

## ٣- دایکە سروشت بەدیهێنا

ئەگەر پێیان بوتیتایە نووسەری ئەم پەرتووکە هەم کوێرەو هەم کەڕە، زۆر سەرسام دەبویت، وانییە؟

ئەی ئەگەر بیان وتایە کوێرو کەڕو بێ ئەقڵیشە؟

وەك ئەوەی ئەمانە بەس نەبێت، ئەگەر ژیانێکی ڕووەکیشم هەبێت، تەنانەت لە کاتی نووسینی ئەم پەرتووکەدا مردوویم...

چی دەڵێیت؟

هەڵبەت بڕواکردن بەهەر یەکێك لەمانەو ئەم بۆچونانە بەتەواوی لات پڕوپوچ دەبن. هەزار جار لەمە پڕوپوچتر ئەوەیە بڵێین باڵندەکەی خۆمان دایکە سروشت بەدیهێناوە. چونکە باڵندەکە لەدەنوکییەوە تاکو پەڕەکانی کلکی زیندەوەری موعجیزەیین بەئەندازەی هێنانەوەیەکی پیتەکان بۆ نووسینی پەرتووکێکی لەم جۆرە کارێکی ئاسان نییە.

وەلێ ئەم سروشتە کوێرە، کەڕە، بێ عەقڵ و فام و مردووە. چونکە ماددە بنەڕەتیەکانی سروشت خاك، هەواو ئاون، هەستی بینین، بیستن و ژیریان نییە و زیندەگییان تێدا نییە. کەچی لەناو باڵندەیەکدا هەموو ئەمانە بونیان هەیە. کەواتە ئەوەی ئەمانەی بەباڵندەکان داوە سروشت نییە.

دوای ئـەم ڕونکردنەوانـە بـا لـە هـەموو ئـەو کەسـانەی شوێنکەوتوی ئەو بیردۆزەن بپرسین:

بـا بڵـێین دایکـە سروشـت باڵنـدەکانی بـەدیهێناوە. ئـەی ماسیەکان، گوڵاڵەسورەکان، مەرجان و دوڕەکان چی؟

سروشت!

ئەی دەریاو زەریاو ئاوەخوڕەکان؟

سروشت!

دارستان، درەختەکان، میوەکان و گوڵەکان؟

سروشت!

ئاسك، کەرەکێوی، شێر، پڵنگ و فیلەکان....

سروشت!

هەموو شت و کەسانی سەر ڕووی زەوی؟

سروشت !

ئەستێرەکانی ئاسمان، هەسارە گەڕۆکەکان، خۆر چی؟

سروشت! سروشت! سروشت!

بەرگەهەوا، هەورەکان، باران، پەلکەزێڕینەو بەفرەکان؟

سروشت!

باشە خۆ ئەوەشـی پێـی دەڵـێن سروشـت، خـۆی هەرلەمانـە پێك هاتووە.

کـە دەڵێیـت سروشـت، ئەگـەر مەبەسـتت کەسـێکە بـەدەر لەهـەموو ئەمانـە، دۆسـتەکەم ئەوکاتـە نابێـت بڵێیـت سروشـت، دروست ئەوەیە بڵێیت خودا، بەدیهێنەری بەرزو بێ هاوتا.

ئەگـەر بـە بیـانووی ئـەوەی نـاوی خـودا نەبـەیت سروشـت دەکـەیت بـەویردی سـەر زمانـت، سروشـت کـردی، سروشـت بەخشی، سروشت هـەڵی سوڕاند، سروشـت ڕای گـرت، سروشـت گەورەی کرد، سروشت بچـوکی کـرد، سروشـت ڕایکێشـاو دووری خستەوە...

دەتوانیت خۆت بخەڵەتێنیت بەڵام ئێمە، هەرگیز!

ئێستا ئایەتێك دەخوێنمەوە جوان گوێ ڕاگرە:

خـودای گـەورە دەفـەرموێت: ((ئاسمانـەکانی دروسـتکردووە بەبێ کۆڵەکە بەچاوی خۆتان دەیانبینن، لە زەویشـدا کێوەکـانی دامەزراندووە کە لەنگـەری زەویـان ڕاگرتـووە (چـەندەها سـودی تریـان هەیـە) نـەوەکو ژێـرو ژوور بـبن و لار ببنـەوە. چـەندەها زینـــدەوەرو گیانلەبـــەری تێـــدا بڵاوکردۆتـــەوە، (هـــەروەها دەفەرموێت) لە ئاسمانیشەوە ئاومان دابەزاند، جۆرەها ڕووەك و گـژوگیای هـاوجوتی بەسـوودو بەکـەڵك و جـوان و ڕازاوەمـان لـە زەویـدا ڕوواند. ئـا ئەمەیـە دروسـتکراوانی خـودا، وەرن نیشـانم

بدەن ئەوانی تر جگە لەو زاتە چیان دروست کردووە، نەخێر هیچیان دروست نەکردووە بەڵکو ستەمکاران هەمیشە لە گومڕاییەکی ئاشکرادان.)) لقمان: ١٠-١١.

هەروەك بینیت ناکرێت ئەو باڵندە بچکۆلەیە خۆی لەخۆیەوە یان بەڕێکەوت دروست ببێت، هەر بەوجۆرەش سروشت توانای وەها کارێکی نییە. ماوەیەکە زۆر پرسیاری هەڵبژاردنت شیکار کردووە، ئەگەر سێ هەڵبژاردنی یەکەم هەڵەبوون وەلامی ڕاست بەبێ دوودڵی هەڵبژاردنی چوارەمە، بۆچونی چوارەم چی بوو؟!

## ٤- یەکێکە لەو زیندەوەرانەی خودا هێناونێتە بوون :

دەستبەجێ نیشانەی ڕاستی لێ بدە! خودای گەورە دەفەرموێت: (( ئایا سەرنجی باڵندەیان نەداوە بەسەریانەوە پۆل پۆل دەفڕن و باڵیان لێکدەدەن. ئەو باڵندانە جگە لە خودای میهرەبان کەس ڕاگیریان ناکات، بەڕاستی ئەو زاتە بەهەموو شتێك بینایە هیچی لێ ون نابێت چاودێری هەموو دروستکراوانی دەکات (فڕۆکە و کەشتی ئاسمانی و ... هتد، هەر ئەو زاتە بە هۆکارەکان لە ئاسمان هاتوچۆیان پێدەکات و ڕایان دەگرێت.)) الملك: ١٩.

# ئایا سروشت دەتوانێت هێلکەیەك هەڵبهێنێت؟

خەریکبوو بابەتی ئەم باڵندەیەم کۆتایی پێدەهێنا ئەم پرسیارەم بەبیردا هات. دواتر هەوڵمدا وەڵامی بدەمەوە.

بەڕای من باشترە ئەمەش بخوێنیتەوە:

تۆ دەتوانیت لە کاغەز فڕۆکە دروست بکەیت؟ وابزانم دەتوانیت. ئەگەر کاغەزێکت بەدەستەوە بێت و بێیت بڵێیت (من ئەم فڕۆکەیەم دروست کرد!)، کەس ناتوانێت بڵێت:

بەڕاست! کوڕە تۆ لەکوێ و ئەم فڕۆکەیە لە کوێ! دەتوانیت بەحەوادا هەڵی بدەیت! بەڵام ناتوانی لە کاغەز فڕۆکەیەك سازکەیت!

باشە گەر ئاماژە بۆ فڕۆکەیەکی ڕاستەقینە بکەیت بڵێیت: (من دروستم کرد)، کێ باوەڕ دەکات؟

بێگومان هیچ کەسێك، چونکە تۆ کارێکی وەهات لەدەست نایەت. زانیاریو تواناو هێزی تۆ بەس نییە بۆ دروستکردنی

فڕۆکەیەك. لەکاتێکدا تەنها چەند ولآتێك لە جیهاندا دەتوانن فڕۆکە بەرهەم بهێنن. کێ باوەڕ بەوە دەکات تۆ بتوانیت فڕۆکە ساز بکەیت.

چواردەورەکەت دەهێنیتە پێکەنین، ئەگەریش درێژە بەم بابەتە بدەیت و نەڵێی (بابە گیان گاڵتەم کرد!)و خۆت بکێشیتەوە پاش ماوەیەك پێت دەڵێن (با بتبەین بۆ لای پزیشك). واهەست دەکەن ژیریت لەدەست دابێت.

ئەوە خاوەنە ڕاستیەکانی فڕۆکەکە با لەولاوە بوەستن، ئەوان ئەگەر گوێیان لێبێ پێت دەڵێن: ((تۆ سەیری ئەو منداڵە بەقەد لاقێکم دەبێت خەریکە خۆی دەکات بەخاوەنی فڕۆکەکەمان. تۆ لەکوێ و دروستکردنی فڕۆکە لەکوێ؟)).

تۆ بۆشت بکرێت هەر تەنها لە کاغەز دەتوانیت فڕۆکە دروست بکەیت. دروستکردنی فڕۆکەی ڕاستەقینە لەلایەن تۆوە کارێکی ئەستەمە. چونکە: بەئەندازەی پێویست بۆ دروستکردنی فڕۆکە زانیاری، توانا، پارەی تەواوت نییە. باشترین گومان بۆ توانای تۆ لە دروستکردنی وێنەی فڕۆکەیەکی ڕاستەقینە تێناپەڕێت، ئەویش -دەی دانی پێدا بنێ- زۆریش لە ڕاستیەکە ناچێت.

قـەت وێنـەی فڕۆکـەت کێشـاوە؟ زۆرجـار کوڕەکـەم داوام لێ دەکات وێنەی فڕۆکەی بۆ دروست بکـەم، بـۆی دەکێشـم بـەڵام ئەوەنـدە ناشـرین دەردەچـێت کـە نـەخۆم بەدڵمـە نەکوڕەکـەم. دەڵێت: ((ئەمە چ فڕۆکەیەکە ئیدی؟)).

باشـە کـێ دەتوانێـت فڕۆکـەی ڕاسـتەقینە دروسـت بکـات؟ دەوڵەتە گەورەکان، دەوڵەتە دەوڵەمەندەکان، ئەوانەی لـە ڕووی تەکنەلۆجیاوە زۆر پێشـکەوتون، ئـەوان دەتـوانن سـازی بکـەن. ئەگەر ئەوان بڵێن:

((ئێمە ئەو فڕۆکەیەمان دروست کردووە)) لەبەرامبەردا کـەس پێیـان ناڵێـت: ((بەڕاسـت ئێـوە لـەکوێ و دروسـتکردنی فڕۆکـە لەکوێ!))

تواناو پارەو زانیاری سازکردنی فڕۆکەیان هەیە...

باشـە ئـەو وڵاتانـەی توانـای دروسـتکردنی فڕۆکـەیان هەیـە دەتوانن باڵندەیەکی ڕاستەقینە دروست بکەن؟ بۆ وێنە کۆترێك، نەورەسـێك، بایەقوشـێك، فلامینگۆیـەك، مراوییـەك، قازێـك، کەڵەشێرێك...

چی دەڵێیت؟ ناتوانن دروستی بکەن وانییە؟

هـەموویان لـەدەوری یـەك كۆببنـەوە، زانیاریـان یەكبخـەن، تواناكانیـان یەكخـەن، هێـزو پارەیـان یەكخـەن، هێشـتا نـاتوانن باڵندەیەكی ڕاستەقینە دروست بكەن.

بگرە باڵی باڵندەیەكیشیان بۆ دروست ناكرێ.

بگـرە پـەڕێكی بـاڵی باڵندەیـەكی ڕاسـتەقینەیان بـۆ دروسـت ناكرێت.

تاكـە نەورەسـێكی بچـكۆلەیان بـۆ دروسـت نـاكرێ كـە خـۆی دەدات بەدەم هەواوەو دەفڕێت.

چـۆلەكەیەكی بچـوك- لـە ئاسمـانی شـیندا لەشـەقەی بـاڵ دەدات، بەدەم فڕینەوە گۆرانی دەڵێت، لەهەر كوێیەك ئارەزووی هەبوو دەنیشێتەوە، لەهەر كوێوە پێی خۆش بوو هەڵدەفڕێت- ناتوانن دروست بكەن. ناتوانن فڕۆكەیەكی لەو جـۆرەش دروسـت بكەن.

چونكە پێشكەوتوترین جۆری فڕۆكە هێندەی ئەوان بـەجوانی ناتوانێت بفڕێت، سادەترین فڕۆكەكانیش تەنانەت ناتوانن لەهـەر كوێیەك بیانەوێ بنیشنەوە یاخود لەهەر كوێیەك بیانەوێ بفـڕن. باسـی ئـەوەش ناكـەم لـەكاتی فڕینـدا دەنگێكـی زۆر بـەهێز دەردەكـەن و ژینگـە پـیس دەكـەن، بەتـەن سـوتەمەنی خـەرج دەكەن.

جارجاریش کەوتنەخوارەوەیان دەبیستین...

ئاشــکرایە کەســێك نایــەت ئــاو بکــات بــەباڵی یــان قاچــی باڵندەکاندا تاکو بفڕن...

دروستکەرانی فڕۆکە باڵندەیان بۆ دروست ناکرێت. گەر ئەوان باڵندەیان بۆ دروست نەکرێت سروشتێك کە نابینێت، نابیستێت، ژیری نییـەو خاڵییـە لـە ژیـان چـلۆن دەتوانێـت باڵـندە دروسـت بکات؟

ئایـا سروشــت دەتوانێــت لــەنێو هێلکەیەکــەوە باڵندەیــەك – توانای لە ئاسماندا فڕینی هەبێت و گەشت بکات– دەربهێنێت.

ڕێکــەوت دەتوانێــت لــەناو هێلکەیەکــەوە هەڵۆیــەك بەهــەموو تەکنیکە دەراساکانی فڕینەوە دەربهێنێت؟

کەناریـیــەك لەســەر ڕووی زەویــدا خۆشــترین ئــاوازی هەیــەو بەستەی جۆراوجۆر دەچرێت دەتوانێـت خـۆی لەخۆیـەوە لـەناو هێلکەیەکدا دروست ببێت؟

ئایا دایکە سروشــت دەتوانێــت تــاوس –پــەڕەکانی جــوانترین ڕەنگیــان هەیــە لەســەر ڕووی زەویــدا– لــەناو هێلکەیــەك دا سازبکات؟

لــەناخی هێلکەکانــداو لــەقوڵایی تاریکیــدا، ئایــا دەگونجێــت دەنوکی مراویەو دەنوکی لەق لەق جیاواز دەرچێت؟ قاچـی نـوك

تیژی هەڵۆکان هەرگیز لەگەڵ قاچی پەردەداری مراویەکان ناگۆڕێت. ئایا تێکەڵ نەبوونی ئەوان لەگەڵ یەکتریدا کێ بەڕێوەی دەبات، سروشت؟

تەنیا ئەو کەسە ساویلکانەی بڕوا بەساحیرەکان دەکەن کەروێشك لە کڵاوەکانیانەوە دێننەدەرەوە، بڕوا بەوەش دەکەن.

بە چ ئەندازەیەك گونجاوبێت سیحربازێك لە کڵاوەکەیەوە کەروێشکێك دروست بکات، هەر بەو ڕادەیەش دەگونجێ بێچوە چۆلەکەیەك بەڕێکەوت یاخود لەخۆیەوە لەهێلکەکەیەوە بێتە دەرەوە. با هەلێك بدەین بەو کەسانەی بڕوای پێ دەکەن.

ئەگەر بینیمان ڕۆژێك فڕۆکەیەك لەخۆیەوە یان لە ئەنجامی ڕێکەوتەوە، لەشوێنی فڕێدانی مەکینەو بزوێنەرە لەکارکەوتووەکاندا دروستبوو، ئەوکاتە دەبێت جارێکی تر بەخۆماندا بچینەوە!

وەڵێ دەبێت ببینین کە فڕۆکەکە زیندووە، لەخۆیەوە دەفڕێت و دەنیشێتەوە، لەکاتی فڕیندا گۆرانی دەڵێت، خانەیەکی هەیەو چەندین هێلکەی تێدایە کە هەریەکەیان توانای خستنەوەی فڕۆکەیەکی بچوکیان هەیە!

– نەخێر گیانەکەم! ئەوەندەش ماف پێشێل کردنی ئەوانە!

– کێشە نییە، باسندوقی ڕەشی فڕۆکەیەك کە سەدەها هەزار جار لەمێشکی کۆترێك ساکارترە خۆی لەخۆیەوە دروست ببێت، ئەمەش زۆرە!

با بزوێنەری فڕۆکەیەك کە ئێجگار لەدڵی پەڕەسێلکەیەك – هەموو ساڵێك هەزارەها کیلۆمەتر ڕێگا دەبڕێت –ساکارترە، لەخۆیەوە یاخود بەڕێکەوت دروست بووبێت.

باڵی فڕۆکەیەك کە ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ باڵی باڵندەیەکدا هیچی تەواو هیچ دەردەچێت، با خۆی لەخۆیەوە دروست ببێت و لەگەڵ یاساکانی سروشتدا ڕێبکەوێت و بەڕێکەوت بێتە بوون.

ئەو کاتە ئیمەش دەتوانین بڵێین ((بەو پێیەی ئەم لەخۆیەوە دروست بوو باڵندەکانیش دەتوانن دروست ببن)).

ئەگەریش ناتوانن دووپاتی بکەنەوەو نیشانمانی بدەن با بێدەنگ بن و بەری بەیانیان لەکاتی سەلام کردن لەخۆر، ئاوازو دەنگی بولبولەکانمان لێ تێك نەدەن و بێزارمان نەکەن، چونکە:

خودای گەورە دەفەرموێت: ((... لە هەموو ئەمانەدا بەڵگەگەلێك بۆ باوەڕداران هەیە)). الأنبياء: ٩٩.